




# نوری ئیسلام

گۆڤارێکی ڕۆشنبیری زانستی ئیسلامی وەرزییە، وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی هەرێمی کوردستان دەری دەکات

سالی چوارەم ژمارە «١٦» - ربیع الاول ١٤٢٣ - جۆزەردان ٢٧٠٢ حوزەیران ٢٠٠٢

مزگەوتی جەلیل خەیات - هەولێر



بسم الله الرحمن الرحيم

إن الصلاة كانت على المؤمنين كتاباً موقوتاً

النساء (١٠٣) صدق الله العظيم

# حیکمەت لە فەرزەکانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام

لای هەموو لایەکمان شاراوە نییە کە خوای بێ هاوتاو پەروەردگار کاتێك پەیامی پیرۆزی ئیسلامی بە مرۆڤایەتی رەوا فەرمووو لەرێگای رابەری مەزن حەزرەتی محەممەد (د.خ) ئەو پەیامە پیرۆزەی ئاراستەی هەموو جیهان کرد. هەندێك ئەرکان و واجباتی لەسەر شانی هەموو ئیماندارێك فەرز کرد هەروەکو لە قورئانی پیرۆزدا هاتووەو لەفەرموودەکانی پێغەمبەری مەزن (د.خ) روونکراوەتەوە، یەکێك لەو ئەرکە پیرۆزانە فەرزی نوێژە کە لە رۆژێکدا (٥) جار جێبەجێ دەکرێت. جا ئەگەر لە حیکمەتی ئەم ئەرکە پیرۆزە وردبینەوە، دەبینین دوو لایەنی هەیە: لایەنی بەدەنیو کۆمەڵایەتی خۆی لەوەدا دەبینێتەوە، کە هەموو مرۆڤێك پێنج فەرزە دەستنوێژ دەگرێت و، ئەوەش شتێکی پێویستە بۆ پاك و خاوێنی ئادەمیزاد. لایەنی دووەمیشی کۆمەڵایەتییە کە خۆی لەوەدا دەبینێتەوە. هەموو موسڵمانێك پێنح فەرزە روو لە مزگەوت دەکات و بەهەستکردن بە گیانی برایەتیو یەکسانی برا موسڵمانەکانی خۆی دەبینێت و ئاڵوگۆری بیروباوەڕ دەکەن و، بەوەش زیاتر پەیوەندی ناو کۆمەڵ توندو تۆڵ دەبێت، لەلایەکی تریشەوە ئەو جموجۆڵەی کە لەکاتی نوێژدا دەکرێت سودێکی زۆری هەیە بۆ جەستەی ئادەمیزادو هاوسەنگییەکی هێزیو جەستەیی دروست دەکات. لایەنی دووەم، کە دیارە ئەوە لایەنە گرنگەکەیەتی بەشی روحی جێبەجێ کردنی فەرزی نوێژکردنە، لەو پێنج فەرزەدا هەموو مرۆڤێك تەئکیدی کۆیلەیی خۆی دەکات بۆ خالقی بێ هاوتا. بەبیری خۆی دێنێتەوە کە ئەو دەستکردی خودایەکی گەورەو بە توانایە کە سنوور بۆ دەسەڵاتی نییە. لەهەمان کاتیشدا نوێژکردن تەئکیدی وەحدانییەتی خودای پەروەردگار دەکات کەهەموو موسڵمانانی جیهان هەر پێنج کات روو لە یەك جێگا دەکەن، ئەویش کەعبەی موشەرەفەیە. هەروەها کاتی نوێژکردن چاکترین دیاردەی یەکسانییە بەرامبەر دەرگای خوداوەند، چونکە هەموو لایەك پاشاو فەقیرو گەداو داواکار لەیەك جێگا دەپارێنەوە، ئەویش مەقامی خالقی هەموو بەشەریەتە. هەموو کاتێکیش لایەنی روحی لەهەموو تاعەتێکدا لایەنی سەرەکییە، چونکە ئەگەر ئەو لایەنە فەرامۆش بکرێت مانای ئەوەیە جەوهەری عیبادەتەکە لە رێڕەوی خۆی دوور کراوەتەوە. ﴿رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّابُ﴾



# خۆرى ئیسلام


گۆڤارێکی رۆشنبیری زانستی ئیسلامی
وەرزییە وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی
هەرێمی کوردستانی عێراق دەری دەکات

# 16

سالّی چوارەم

ربیع الاول ١٤٢٣ کۆچی    جۆزەردانی ٢٧٠٢ ی کوردی

حوزەیرانی ٢٠٠٢ی زایینی



خاوەنی ئیمتیاز
**عەدنان نەقشبەندی**

سەرنووسەر
**خورشید شێرە**

جێگری سەرنووسەر
**عوسمان رەشاد موفتی**

بەرێوەبەری نووسین
**مەلا عبداللطیف بامۆکی**

بەرێوەبەری کارگێری
**قاسم رەسول بەرزنجی**

سکرتێری نووسین
**مەریوان مەحمود کاکە شێخ**

**ناونیشان**

هەولێر   دیوانی وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی
بەرێوەبەرایەتی راگەیاندن
☎ ٢٢٣٠٩٤٤
٢٢٢٢٦٩٣


---


پیت چنین: کۆمپیوتەری وەزارەت    نەخشەسازی: کۆمپیوتەری دەریا
فەرزی بەرگ: چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین/ هەولێر

# ناوەرۆك







لَيْسَ الْبِرَّ أَنْ تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ وَآتَى الْمَالَ عَلَى حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّائِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ وَأَقَامَ الصَّلَاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَالْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُوا وَالصَّابِرِينَ فِي الْبَأْسَاءِ وَالضَّرَّاءِ وَحِينَ الْبَأْسِ أُولَئِكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ

**صدق الله العظيم**

**( سورة البقرة/ ١٧٧ )**

**کاری چاك هەر ئەوە نییە روو دە رۆژهەلاتیٚ بکەن یا رۆژئاوا، چاك ئەمەیە باوەڕیتان بەخواو رۆژی سەلایەو فریشتان و کتیٚب و پیٚغەمبەرانی خودا هەبیٚ.. و لەو سامانەی (( هەرچەند زۆریش و خۆش دەویٚ )) بەشیٚ بدەن بە خزمان و هەتیوان و هەژاران و ریونکان و پارسەکان و عەبدانێ پیٚ بکڕنەومو نویٚژ بکەن و زەکات بدەن، هەر کاش پە یمانیٚك دەبەستن نەی شکیٚنن، لە نەداریو گرفتاریو تەنگانە دا خۆڕاگرىن، مرۆی بەراستی ئەوانەن و دیارە لەخودا دەترسن.**

**قورئانی پیرۆز، مام هەژار/ ٢٧**





## حەرام و حەلاڵ

سەردار دەفەرمووی:

## الحلال ما أحلّه اللّهُ والحرام ماحرّمه اللّهُ وماسكَتَ اللّهُ عنه فهو ماعفا عنه.

ترمزی ریوایەتی کردووە

بناغەی سوودو قازانج حەلاڵ بوونەو زیان و خراپە حەرام و ئەوەی باس نەکراوە بەزەیی خودایەو لەبیرچوونی نییەو زۆر لێی مەپێچنەوە.

مختصر العلائی/ ٦٠٨

نزاو پاڕانەوەی باوەڕدار

## اَللّهمّ إني اسألكَ الهُدى والتُقى والعفاف والغِنى

خودایە. بەڕاستی مـن ڕێ ڕوونـی و پارێزگـاری و داوێـن پاکی و قەناعەت و بێ ئحتیاجی هەر لە تۆ داوادەکەم.

موسلم ریوایەتی کردووە





# شەهید عینوانی بەرزی و شكۆی نەتەوەیە

پەیامی

خۆری ئیسلام

سەرنووسەر

هەر نەتەوەیەك گیانی خۆ بەختكردن و فیداكاری تێدا بێت نەتەوەیەكی زیندووە، دوژمن شكێنە، سەربەرزو خونكاری گەل و خاك و سەروەرییە، تەنها خوێنی شەهیدە ورەی دۆستی قایم كردووە، وزەو توانای بە رۆڵەكانی بەخشیووە، چۆكی بە نەیارو دوژمنە رق ئەستورەكان داداوە، نرخی ژین لە خوێنی شەهیدەوە بە های خۆی وەردەگرێ.

هیچ سەربەرزییەك لە شەهادەت بەرزتر نییە، هیچ شانازییەك لە بەخشینی گیان رەواتر نییە، خوێنی شەهید هاوتایە بە ئایین و مرۆڤ و نیشتمان، نرخی تەنها نەمرییە بۆ خاوەنەكەی و خزم و نزیكانی و هاوزمان و هاونیشتمانەكانی، تەنها رێگەیە بۆ ئازادی و سەربەستی و سوود وەرگرتن لە ژیان، شەهید شوورەی نیشتمانە، چاوی گەشی نەوەی نوێ روون دەكاتەوە هەرچەندە وشەو دەستەواژە هەیە لە وەسفی شەهیدو چەند پێنووس و سۆز هەیە، چەند شیعرو پەخشان هەیە هاوتا نابێت. لەم وتارەی خودا كە دەفەرموێت: ﴿وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتًا بَلْ أَحْيَاءٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ/ آل عمران-١٦٩﴾ ئەوەیە نرخی شەهیدو خوێنی شەهیدو بەژن و باڵای شەهید، هەموو چاكەی ئەمڕۆ سبەی لە شەهیددا كۆبۆتەوە، بۆ ئەمڕۆ پەیمان و راستیو وەفاو بەرزی خاك و نیشتمان و پاراستنی شەرەف و ئایین و پارێزگاری باوەڕو ئیسلام و شەهیدو بۆ سبەی دەستپاكیو دڵپاكیو بەرزو شكۆی نەتەوەو نەمریو بەهەشتی بەرین و پاداشتی پەروەردگار: ﴿وَلَئِنْ قُتِلْتُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَوْ مُتُّمْ لَمَغْفِرَةٌ مِنَ اللَّهِ وَرَحْمَةٌ خَيْرٌ مِمَّا يَجْمَعُونَ/ آل عمران-١٥٧﴾ هەر نەتەوەیەكی زیندوو بەو شێوەیە بیر لە ژیان و مردن بكاتەوە هەرگیز ئاڵای نەوی ناكرێت، سوپای شكست ناهێنێ، سەربازی لە گومان و دوودڵیدا ناژیێت، بەرەو مردن هەنگاو دەنێت وەك ئاوخواردنەوە دروشمی گۆڕەپانی جەنگەكان بەم شێوە دەبێت: ئەگەر گیان لە پێناوی بیرو باوەڕدا نەڕوات پاش ماوەیێ بە خۆڕایی بار دەكات،

نەتەوەی كورد كە هەتا ئێستا ماوە لەبەر ئەوەی بۆ هەر كات و شوێن و حاڵەتێك پڕە لە شەهید، رێگەی ئازادی بۆ نەخش كردووەو درەختی سەربەستی ئاودێر كردووە و بەرهەمی داوە بەنەتەوەی نوێو ئەمڕۆ لە هەموو رۆژێ زیاتر ئامادەیە كە بەرگری لە مان و ماف و بوونی خۆی بكات.

ئێمە لەخۆری ئیسلام لەبەر روناكی خوێنی شەهیدان تیشكی لاشەی زیندووی نەمرانی رێگەی رزگاری كوردوكوردستاندا هەمیشە هەوڵ دەدەین، كە پاشماوەی نەمران و نەوەی شەهیدان بەدڵنیاییو ئارامی تەماشای پاشەڕۆژی خۆیان بكەن، هەتا توانامان هەبێت بەبەرزیو شكۆیی هەرچی زیاتر هەیە تەماشای دەكەین.

بسم الله الرحمن الرحيم ﴿إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ* فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ* إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ الأَبْتَرُ﴾.





# باوەرئینان بە پێغەمبەرێن خودێ

## ژێهات بارزانی

مە باوەری هەیە کو خودێ هندەك پێغەمبەر شیاندنە ژ خەلکێ رە، داکو رێکا خودێ و دینێ وی نیشاوا بدن، بەلکی چ قەوم نینن کو خودێ پێغەمبەر ژ وارە نەشیاندبن خودێ دبێژێ: ﴿وَإِنْ مِنْ أُمَّةٍ إِلاَّ خَلاَ فِيهَا نَذِيرٌ/ فاطر-٢٤﴾.

هەر وەکی چقا پێغەمبەرێن وەکو خودێ شیاندن [illegible] بزمانێ قەومێ وا دشیاندن دەقەنە بزانن کا چ دبێژ هەر وەکی خودێ دبێژێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ رَسُولٍ إِلاَّ بِلِسَانِ قَوْمِهِ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ /ابراهيم-٤﴾ ئەم زانن کو پێغەمبەرێن خودێ گەلەکن لێ بەلێ ناڤێ حەمووچکا نەهاتیە د قورئانێ دە، بەلێ مە باوەری ب گشا هەیە، خودێ دبێژێ: ﴿وَرُسُلاً قَدْ قَصَصْنَاهُمْ عَلَيْكَ مِنْ قَبْلُ وَرُسُلاً لَمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ/ النساء-١٦٤﴾ مە باوەری هەیە کو پێغەمبەر حەموو پاقژن ژ گونەهاو ژ بێ ئەمرییا خودێو حەچی پێغەمبەرەکی هاتی خودێ موعجیزەیەك وەسا داییێ کو خەلك باوەریێ پێ بینن، مە پێغەمبەرێ مە موعجیزاتێ وی گەلەکن، بەلێ ژ حەمووچکا مەستر قورئانا پیرۆزە چنکو موعجیزاتێ پێغەمبەرا حەموو دوەختێ وا دەبوون و ئەو ژی د گەل خودانێ خوە چوون بەلێ قورئانا پیرۆز وی بمینێ حەتا رۆژا قیامەتێ.

دڤێ ئەم بزانن کو دینێ پێغەمبەرا هەر ژ ئادەم بگرە حەتا موحەممەد سلاڤێن خودێ لحەمووچکابن، هەر یەکە، (ئیسلامە) یانی باوەری یاب ئێکیتی یا خودێیە بهەرسێ جورێ خوەڤە (ئێکیتیا پەروەردێ)، و یا پەرستنێ و یا ناڤ و رەنگا گوە بدە (نوح) پێغەمبەر سلاڤێن خودێ لسەر بن چاخێ کو دبێژێ: ﴿وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ الْمُسْلِمِينَ/ النمل-٩١﴾ سەح کە ئیبراهیم پێغەمبەر سلاڤێن خودێ لسەربن دبێژێ: ﴿إِذْ قَالَ لَهُ رَبُّهُ أَسْلِمْ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ/ البقرة-١٣١﴾ پێغەمبەر سلاڤێن خودێ لسەر بن دبێژێ: ﴿وَقَالَ مُوسَى

**يـاقَوْمِ إنْ كُنْتُـمْ آمَنْتُـمْ بِاللَّـهِ فَعَلَيْهِ تَوَكَّلُوا إنْ كُنْتُمْ مُسْلِمينَ/** يونـس-٨٤﴾ ژكيـس (عيسـى) سلاڤێن خـودێ لسـەربن هاتيـە: ﴿**وَإِذْ أَوْحَيْتُ إِلَـى الْحَوارِيِّـينَ أَنْ آمِنُوا بِـي وَبِرَسُولي قَـالُوا آمَنَّـا وَاشْهَدْ بِأَنَّنَـا مُسْلِمُونَ**/ المائدة-١١١﴾،و خـــودێ ژ كيـــس پێغەمبـەرێن (بنـى اسـرائيل) يـا دبێـــژێ و بەحســـێ تـــەوراتێ دكێ﴿**يَحْكُمُ بِهَا النَّبِيُّـونَ الَّذِيـنَ أَسْلَمُوا لِلَّذِيـنَ هَـادُوا**/ المائدة-٤٤﴾ ئـەم باوەريـێ تيـنن كـو پێغەمبـەرێ مە چوويە ئـەزمانا بروحـا خـوە وكەلاشـێ خەڤـە و شـــيار نـــەكر رازايـــى و ئـــەم بـــاوەرێ تينـــن كـــو ئـــەو ژ بـــۆ خـەلكێ جيـهانێ تـەڤدە هاتيـە دڤـێ حـەموو، باوەريـــێ ب وى بينن.

ئـەم باوەريـــێ بكەرامـــەتێن ئەولياڤا دكـن ئـەو كەسێن سـەر رێكـا پێغمبــەر دچــن، ئەگــەر هندەك لسەر رێكا پێغمبەر نەچن لسـەر دەسـتێ وا ديـار بـبن كـو رەنگێ وا وەكەيێ كەرامـەتا يـێ ئەو هنگى نەكەرامەتە بەلكى ئەو (ئيسـتدراجە) خودايـێ مـەزن دبێژێ: ﴿**وَالَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَـا سَنَسْتَدْرِجُهُمْ مِنْ حَيْثُ لاَ يَعْلَمُونَ**/ الاعراف-١٨٢﴾.

لێ بەلێ نەكو حەجى كەرامـەتێ وى نـەبن يـانى ئـەو نـە وەليـێ خودێيـە؟ بـەلكى وەليـێ خـودێ حـەجى مرۆڤێ موسلمان بى و ژ خودێ بترسـێ و بـێ ئـەمريا وى نـەكێ ئـەو وەليـێ خودێيـە چ كەرامـەتێ وى هـەبن و، چ نـەبن. خـودێ دبێـژێ:﴿**أَلاَ إِنَّ أَوْلِيَـاءَ اللَّـهِ لاَ خَـوْفٌ عَلَيْـهِمْ وَلاَ هُـمْ يَحْزَنُـونَ الَّذِيـنَ آمَنُـوا وَكَـانُوا يَتَّقُونَ**/ يونس-٦٢-٦٣﴾.

ئـــەم باوەريــێ تينـــن كـــو پێغەمبـەرێ مـە نـەكو بـەس ژ ئينسـانا رە هاتيـە؟ بـەلكى ژ ئـەجننى يـا رە ژى هاتيـە، يـانى دڤێ ئەوژى باوەريێ بپێغەمبەرێ مـە بينـن نـەخوە وێ بـبن كـافرە هـەرن دوزەخـێ، چنكـــو رۆژا قيامـەتێ پرسـێ ژ وابـێ كـرن: گـــەلۆ چ پێغەمبـــەر ژوەرە نـــــەهاتبوون؟ خـــــودێ دبێژێ:﴿**يَامَعْشَرَ الْجِنِّ وَالإِنْسِ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِنْكُمْ**/ الانعـام-١٣٠﴾.

مـــە بـــاوەرى هەيـــە كـــو پێغەمبـــەرێ مـــە دووماهيكـــا حـــــەموو پێغەمبەرايـــــە و چ پێغەمبـەر پشـتى وى نـاييێن، و دينـێ وى، وێ بمينـێ حەتا رۆژا قيامـەتێ. خـودێ دبێـژى: ﴿**مَـا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَـدٍ مِنْ رِجَـالِكُمْ وَلَكِنْ رَسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّـينَ وَكَـانَ اللَّـهُ بِكُلِّ شَـيْءٍ عَلِيمًـا**/ الاحزاب-٤٠﴾.

ئو پێغەمبەر بخوە دبێژێ: (ان سيكون بعدي كذابون ثلاثـون، كلهم يدعي انه نبي، وانا خاتم النبيين، ولا نبي بعدي).

# المسلم من سلم المسلمون من لسانه ويده

## باوەردار ئەوەيە هاوبيرەكانى ئەمين بن لە دەست و زمانى

**بوخارى ريوايەتى كردووە**





**وەزیری ئەوقاف لەدیمانەیەکی رۆژنامەی ( هاند لسبلاد ) و رادیۆی ( ۱ )ی هۆڵەندەدا**

# گەلی کورد هەموو جۆرەکانی تیرۆر رەت دەکاتەوە، چونکە خۆی گەورەترین قوربانی کاری تیرۆرستیو سیاسەتی پاکتاوکردنی نەژادی بووە

ئامادەکردنی: شەهرام کامل

سەر لە بەیانی رۆژی پێنج شەممە ۲۰۰۲/۳/۱٤ بەڕێز شێخ عەدنان نەقشبەندی وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی پێشوازی کرد لە رۆژنامەنووسی بەناوبانگی هۆڵەندا (بێرنارد باومان) کە بەرپرسی نووسینگەی رۆژهەلاتی ناوەراستی رۆژنامەی (هاند لسبلاد)ی هۆڵەندیو رادیۆی (۱) هۆڵەندایە کە بارەگاکەی لەشاری ئەستەنبوڵە لە تورکیا. رۆژنامەنووسی ناوبراو کە بەهاوڕێیەتی (هەڤال ئەمین)ی رۆژنامەنووسی کورد لە هۆڵەندا هاتبوو. دیدارێکی رۆژنامەوانی لەگەڵ وەزیری ئەوقاف رێکخست و چەندین پرسیاری لەسەر رەوشی ئایینی هەرێمی کوردستان کرد بەتایبەتیش بارودۆخی دوای رووداوەکەی ۱۱ی سیپتێمبەری ئەمریکا. وەزیری ئەوقاف لە وەڵامی پرسیارێکدا لەسەر پێکەوە ژیانی ئایینی ئاماژەی بەوە کرد کە پێکەوە ژیانی ئایینیو نەتەوەیی ستراتیژیەتێکی حکومەتی هەرێمی کوردستانەو گەلی کوردیش هەردەم لەبەر رۆشنایی تەوجیهاتی سەرۆک بارزانیدا ئەم گیانی پێکەوە ژیانە پتەوتر دەکات، لەبارەی دیاردەی تیرۆر لەناوچەکەشدا بەڕێز شێخ عەدنان نەقشبەندی ئاماژەی بەوە کرد کە گەلی کورد گەورەترین قوربانی تیرۆری رژێمە دەسەڵاتدارەکان بووەو رووخاندنی زیاتر لە چوار هەزار گوندی کوردستان و ئەنفال کردنی (۱۸۲) هەزار کەس و بێ سەرو شوێن کردنی (۸) هەزار بارزانیو لەناوبردنی (۵) هەزار کەس بە چەکی کیمیایی لەشاری هەڵەبجە، نموونەی ئەو تیرۆرەیە کە دەرحەق بە گەلی کورد کراوە. لەبەر ئەوە وەزیری ئەوقاف دووپاتی کردەوە کە گەلی کورد لەهەموو کەس زیاتر دژی تیرۆرو تیرۆرستانەو ئەگەر دیاردەیەکیش هەبووبێت ئەوا لە ئەنجامی مانەوەی چارەسەرنەکردنی یەکجارەکی کێشەی کورد بووە لەناوچەکەدا، کە لەلای چەند کەسێك بووەتە حاڵەتێکی دەروونی خراپ و ئاستی بیرکردنەوەی لاواز کردووە. لە کۆتایی دیدارەکەدا رۆژنامەنووسی میوان خۆشحاڵی خۆی بۆ رەوشی سیاسیو ئایینی هەرێمی کوردستان دەربڕیو هیوای خواست گەلی کورد بەهەموو مافە رەواکانی شاد بێت و بەڵێنیشیدا کە ئەو راستییەی لە هەرێمی کوردستاندا دەیبینێت بە ئەمانەتەوە لە رێگای رۆژنامەو رادیۆو دەزگاکانی راگەیاندنی ئەوروپادا پەخشی بکات و بڵاوی بکاتەوە.





# كەڵە پیاوی ئایین پەروەر شێخ حسامەددین شێخ محەممەد بەهائەددین نەقشبەندی

نەزیف بابا حاجی هەورامی

من شێخ حسامەددینم نەدیووە، بەڵام وەك ساوایەكی بنەماڵەی مەلا نەزیری گەورە. وەك كوڕێكی هەورامی. وەك مامۆستایەكی ناوچەی هەورامان و هەڵەبجە. كەمێك لە كەڵەپیاوی ئایینیم بیستووە كە ئەویش شێخ حسامەددینە.

١. لەساڵی ١٩٥٣دا لە هەوارگەی بۆینیان لە (شنرویَ)[1] لە باوكم بیست كە ماوەی ساڵێك كاتبی شێخ حسامەددین بووە زۆر سودی لێ وەرگرتووە وەك كاری پزیشكی میللی. برازای خۆی لێ مارەكردوە (كچی شێخ مەزهەری برای بووە).

٢. چاوپێكەوتنی شێخ حسامەددین و رەزا شای ئێران لەپشت (ئاوێسەر)[2] لەم كاتەدا رەزا شا نەبووە، بەڵكو دەوری نادر شا بووە. شێخ دەڵێت: بابە حاجی بەیانی لەپاش نوێژ سەردانێكی ئاوێسەر دەكەین لەماڵی مەلا بەكر كەمێك نان دەبەن لەگەڵ كەمێك ماستدا دەگەنە ئاوێسەر پاش كەمێك سەیر دەكەن لەناو خاكی ئێراندا لەپشت ئاوێسەرەوە لەشكرێكی زۆر سەری هەڵداوە، شێخ دەچێتە ناو یەكێك لە چادرەكان، پاش ماوەیەك دێتە دەرو روودەكاتەوە رەزا دوعای بۆ دەكات. رەزا شاو محەممەدی



كوڕی تا مابوون رێزی تایبەتیان بۆ ئەو بنەماڵەیە هەبوو.

٣. رازمارە: ئەفسەرێكی ئێران دەبێت چاوی بە شێخ حسامەددین دەكەوێت، شێخ دەڵێت: تۆ پاش بیست ساڵ دەبیت بە سەرۆك وەزیران، ئەویش دەڵێت: قوربان من چۆن دەبم، شێخ دەڵێت: (خوا بڕیاری داوە) رازمارە دەڵێت: بە رۆژو بەمانگ و بەساڵ دەمژمارد تا بیست ساڵ تەواو بوو بڕیاری شاهانەم بۆ دەرچوو بووم بە سەرۆكی وەزیرانی ئێران. (لە باقی حاجی حسن)[3]ی تەوێڵەیی، مجەلەیەكی ئێران ئەم باسەی نووسیووە.

٤. شێخ حسامەددین زۆر پیرۆز بووە رێزی خۆی زۆر بەبەرزی راگرتووە. مەلیك فەیسەلی یەكەم دێتە خورماڵ هەرچی بەگ و شێخ و مەلاو




پیاوی ناودار هەیە هەمووی
دەچن بەپیریەوە تا سەید سادق
ئەو لە ژوورەکەی خۆی نایەتە
دەرەوە تا دەگاتە بەردەم دەرگا
بەخێر هاتنی دەکات لەپاشدا
مەلیك بریاردەدات مووچەی بۆ
دابین بکات، دەڵێت: من مووچەی
دەولەتم ناوێت یەزدان مووچەی
بۆ من بڕیومەتەوە.

٥. لەساڵی ١٩٦٧ لە حاجی
مەلا ساحیبی مەلا نەزیر ئیمام و
خەتیبی تەوێڵەم بیست. پاش
دەرچوونم گەڕامەوە بۆ تەوێڵە
بووم بە ئیمام لە مزگەوتی
گەورە، زۆر دڵخۆش بووم بە
کارەکەم چەند فەقێیەکم هەبوو.
دەوروبەری شێخ حسامەددین بە
دەروێش و حاڵکردن باوبوو،
بەڵام من گوێڕایەڵی ئەو ڕێگایە
نەبووم، جا بەرهەڵستیم دەکرد.
ڕۆژێکیان دۆستێکم هاتبوو بۆ
لام پاش نوێژی عەسر روومان
کردە چەمی خواروو کە لەسەر
ڕێگای خانەقا بوو گەیشتمە
ناوەڕاستی بازاڕ (کەمەندێك)[٤]
کرایە ملم تا گەیشتینە سەر
پردەکەی خانەقا دەبوایە بە
ڕێگاکەدا بڕۆیشتمایە، بەڵام
کەمەندەکە بەسەر پردەکە بردمی
تا گەیشتینە سەر حەوزی
خانەقا، شێخ لەگەڵ کۆمەڵێك
پیاواندا دانیشتبوو فەرمووی:
(ها ساحیب خێرە وا هاتووی)
ئەویش بە ملکەچییەوە دەڵێت:
قوربان خۆت دەزانیت چۆن
هاتووم، کەمەندەکە لادەچێت
دەڵێت: دەفەرموو دانیشن. بۆ
پیاوی وەك تۆ نەهاتووە ڕێگاگیر
بێت، سوێندی خوارد لەو کاتەوە
دڵسۆزی حسامەددینی خوا
پەرستم.

٦. لەساڵی ١٩٥٥-١٩٥٦
لەماڵی کاردۆخی دەمخوێند لە
هاوینی ئەو ساڵەدا شێخ
(موعتەسەمی کوڕی شێخ
حسامەددین)[٥] لە ئێرانەوە هات
بۆ ماڵیان لە ماڵی کاردۆخی باس
لە کەڵەپیاوە گەورەکان دەکرا
لەوانە (شێخ حسامەددین)بووە،
وتی: کاردۆخی با باسی
(باباعەلی)[٦] بکەم. ڕۆژێکیان
بەهارە دونیا زۆر جوانە ڕۆژ
ڕۆژی هەینی بوو. داوام لێ کرد
بڕیار بدات بچم بۆ ڕاو، وتی:
(محە)[٧] مەچۆ هیچ ناکوژیت،
وتم تۆ بڕیار بدە من دەچم
ڕاویش دەکەم. فەرمووی مەچۆ
تا سێجار. لەپاش سێجارەکەش
فەرمووی دەبڕۆ، بەڵام هیچ
ناکوژیت. بە دڵێکی زۆر
خۆشەوە ڕووم کردە (شرام)[٨]
کەڵێکی حەفت ساڵم دی تەقەم
لێکرد پڕپێکام چوومە سەری
لەجێگاکەیدا (خوێن)هەبوو،



بابا حاجی هەورامی

بەڵام خۆی دیار نەبوو ماوەیەك
گەڕام بەشوێنیدا دۆزیمەوە
دیسان تەقەم لێ کرد پڕپێکام
دیسان دەرچوو تا چوار جار من
هەر تەقەم لێ کرد ئەو هەر ڕای
دەکرد تا نزیك ئێوارە. زۆر
دڵگران بووم گەڕامەوە. شێخ
لەسەربانی هەیوانەکە دەگەڕا،
پێی وتم مەڕۆ (ها بگرە) ئەوە
چوار گوللەکەت کە تەقاندت
سوێندی خوارد چوار گولەی
پێدامەوە.

٧. لەساڵی ١٩٥٧-١٩٥٨
لەماڵی مەلا حوسنی قازی
دەمخوێند باسی گەورەیی
حسامەددین کرا مەلاش
گێڕایەوە، یەکێك لە بەگزادەکانی
لەهۆن داوای (حەمیدە
خان)[٩]دەکات شێخ ڕازی نابێت.
بۆ ئەوەی ئەم کێشەیە حەل




بكرێت، كۆبوونەوەیەك دەكرێت لەنێوان بەگزادەی جاف و بەگزادەی لهۆن بریاردەدەن سەردانی (باخە كۆن)[١٠] بكەن رۆژ دیاری دەكەن دەڕۆن بەرەو باخەكۆن لە رێگادا دوور لە باخەكۆن یەكێك لە بەگزادەكان دەڵێت: (چۆن نایدات بە حوكمی دەمانچە دەبێت بیدات). پاش چەند سەعاتێك دەگەنە باخەكۆن شێخ ناچێت بۆ بەخێر هاتنیان شێخ محەممەدی كوڕی شێخ لەوێ دەبێت دەچێت بۆ لای باوكیو دەڵێت قوربان میوانەكان هاتوون چاوەڕوانی تۆن. شێخ پاش ماوەیەك دەڕوات لە دەرگاكەوە دەڵێت: بەخێر بێن (كامتان بە حوكمی دەمانچە هاتوون) با هەڵسێت، سوێندیان خوارد هەموومان لەرزمان لێ هات ئەم كابرایە كە سێ سەعات رێگا دوور لە شێخ ئەم قسەیەی كردووە چۆنی زانی بەم جۆرە جوابی داین و گەڕاینەوە بێ ئەوەی كارەكەمان سەر بگرێت.

٨. لەساڵی ١٩٥٩ لە تەوێڵە لە سۆفی عەبولی تەوێڵەییو لەچەند پیاوێكی تری هەورامانم بیست و لەپێش جەنگی جیهانی دووەم چەند جولەكەیەك هاتن بۆ خورماڵ داوای دار بكەن لە شێخ بۆ دروست كردنی كلێسە، كات كاتی نوێژی عەسر بوو زۆر كەس لە مزگەوتەكەدا دانیشتبوون پاش نوێژ جولەكەكان سەردانی شێخیان كرد داوای داریان لێ كرد شێخ فەرمووی زۆر چاكە یەكەم كەس لە باخەكانی خۆمەوە دەست بكەن بە برینی دار هەر كەسێ داری هەیە بابیدات.. زۆر كەس داری داو جولەكە گەڕانەوە بۆ هەڵەبجە بەدڵێكی خۆشەوە، پاش ماوەیەك (دەروێش بوون بە دوو بەشەوە) بەشێكیان دەیان وت شێخ شێت بووە بەشێكی تر دەیانوت باشی كرد. قسە گەیشتەوە دەمی شێخ، شێخ كۆی كردنەوەو وتی براینە (خوا بزانێت من دارم بە كلێسە نەداوە)، دارم بۆ مزگەوت داوە پاش ساڵی ١٩٤٨ جولەكە گەڕانەوە بۆ فەڵەستین ئەو كلێسەیە كرا بە مزگەوت و ناونرا (مزگەوتی ئەحمەدی). مامۆستا مەلا عومەر عەبدولعەزیز ئیمام بووەو، چەند جارێك (خۆم) نوێژم تیا كردووە. بەلام شێخ كۆچی دوایی كردبوو ئەوانەی نارازی بوون بۆ دارەكان زۆر پەشیمان بوون لە قسەكانیان.. لەساڵی ١٩٨٨ بەكیمیا بارانی هەڵەبجە رووخا.

٩. لە ساڵی ١٩٢٧دا مامۆستا گۆران دەبێت بە یەكەم مامۆستای تەوێڵە، بەڵام مندالان ناچن بۆ قوتابخانە لە ساڵی دووەم شێخ دوو برازای خۆی دەنێرێت بۆ قوتابخانە (شێخ محەممەد ئەمینی كاكە شێخ و شێخ سەفائەددینی كاكە شێخ) هەردووكیان خوێندن تەواو دەكەن و دەبن بە مامۆستا لەو قوتابخانەیەدا پاش كۆچی شێخ حسامەددین. ئەوەندە بە پیرۆزیان زانی تا ئێستا ئەو قوتابخانەیە ماوە و ئێستا زۆر پزیشك و ئەندازیارو مامۆستای تیا هەڵكەوتووە.

١٠. لەساڵی ١٩٦٠-١٩٧٠ زۆر سەرگوزشتەی جەنابی شێخ حسامەددینم بیستووە، لەوانە دۆی كردووە بە خێر لەگەڵ تودا، پشتی هەژاری گرتووە، بێ تەماع بووە، رازی نەبووە كەس بستێ زەوی داگیر بكات.

١١. رۆژێكیان كۆمەڵێك مەلاو دەروێش و سۆفی لەلای دادەنیشن باسی یەزدان




پەرستی‌و پاکی‌و راستی‌و ئایین پەروەری دەکەن یەکێك لە مەلاکان دەڵێت بە مەلایەکی تر ئەم قسانە راست نییە ئەگەر ئەو خوا پەرستە بۆ ناڕوات بۆ حەج پاش ماوەیەك شێخ روو دەکاتە مەلاکەو دەڵێت تۆ لە دڵی خۆتداو بە دەم داوا دەکەیت من بۆ ناچم بۆ حەج، مەلاکە دەڵێت: بەڵێ قوربان. شێخ دەڵێت برالە خوا نافەرمووێت ئەوەی دەسەڵاتی هەیە دەبێ بڕوات بۆ حەج؟ مەلاکە دەڵێت بە قوربان تۆ ئەم هەموو باخ و باخات و زەوی‌و زارەت بۆ چییە، شێخ پشتێنەکەی دەکاتەوەو چوار لیرە دەردەهێنێت و دەڵێت بڕوا بکە لە پارەی خۆم ئەم چوار لیرەیەم هەیە چۆن دەبێت لە پارەی وەقفی خانەقا بچم بۆ حەج.

بەڕێزان ئەگەر چەندین لاپەڕە لەسەر شێخ حسامەددین پڕ بکرێتەوە هەر کەمە. لەیەزدان داواکارم ئەو بەبەهەشت شاد بووبێت و ئێمەش بخاتە سەر رێگای راستی‌و جەزای خێری ئێوەش بداتەوە کە شێخ حسامەددین بە مرۆڤی ئێستا بناسێنن و ئەویش کارەکانی بۆ یەزدان ئەنجام داوە بەمەبەستی خزمەتکردنی ئایینی ئیسلامی پیرۆز. یەکەم کەس بووە کە داری پیرۆزی (زەیتون)ی لە باخە کۆندا رواندووە تا ئێستاش ماوە.

**پەراوێز:**

١-شنروێ: هاوینەهەواری بۆین بووە سەر بە هەڵەبجەیە.
٢-ئاوێسەر: کانیاوێکی نزیك سنووری ئێرانە.
٣-باقی حاجی حەسەن: خاوەنی ئوتێلی مەولەوییە خەڵکی تەوێڵەیە.
٤-کەماند: ئەو گوریسەیە کە وڵاخی پێ دەگیرێت.
٥-موعتەسەم: یەکێکە لە کوڕەکانی شێخ حسامەددین لە سنە دادەنیشێت.
٦-بابا عەلی= حسامەددینە چونکە ناوی عەلی بووە.
٧-محە= موعتەسەم: بچووك کراوەی موعتەسەم بووە لە خۆشەویستیدا وتویەتی.
٨-شرام: شاخێکە نزیك باخە کۆن
٩-حەمیدە خان: کچی شێخ حسامەددینە.
١٠-باخە کۆن:گوندێکە نزیکی خورماڵ مەرقەدی پیرۆزی حسامەددین لەوێیە.

سەرچاوە:
سوودم لە حاجی محەممەدی حاجی سادق وەرگرتووە.







## سەرنجێك لە ژیانی

# مامۆستا شێخ عەبدولعەزیز پارەزانی

حەسەن مەحمود کەریم

هەر لەو کاتەوە کە فتوحاتی ئیسلامی رووی لە ولاتی کوردەواری کرد هەروەك مامۆستای مێژوونووس ئەمین زەکی دەڵێت(کوردەکان بینیان و تێفکرین کە ئەم ئایینە تازەیە بە تەواوی *موافقی تەبع و ویجدانیانە*، لە بەر ئەوە بە ئاسانی بەرە بەرە قبوڵیان کرد. . .)[١]

کورد بەبێ بەرگری کردن بوو بە موسڵمان و خۆی لە رێورەسمی ئایینە نوێیەکەی حاڵی کرد. چەندین قوتابخانە و حوجرە و مزگەوتی پڕ لە مامۆستاو فەقێی خستەوە، هەموو شارو دێیەکی دوورو نزیك مزگەوتی پڕ لە مامۆستاو قوتابی پێکهێنا، بە جۆرێك کە لەوە دەچێت لە ماوەیەکی کەمدا هەموو کورد لە باس وخواسی ئایینەکەی تێگەیشتووە و، دەست بە دەست هەتا ئەمڕۆ هەر لە بەرەو و پێشکەوتن دابووە.

مامۆستا پارەزانی یەکێك بووە لەو زاناو خاوەن حوجرەو مزگەوتانەی کە دەوروبەری خۆیان قەرەباڵغ و منەوەر کردووە.

مامۆستا ناوی عەبدولعەزیز کوری شێخ ئەمین شێخ ئەحمەد پارەزانییە، لە بنەماڵەی شێخ ئیلیاسە، لە ساڵی (١٩٢٨)دا لە دێی پارەزانی سەر بە ناوچەی شارباژێر لە پارێزگای سلێمانی چاوی بە دنیا هەڵهێناوە، لە تەمەنی حەوت ساڵییەوە باوکی دەیخاتە بەر خوێندن لە حوجرەکاندا، سەرەتا لە دێی دۆڵپەمو، پاشان بۆ شارەزوورو هەڵەبجەو دێی پریس ئەمبەروئەوبەر دەکات و خوێندنی فەقێیەتی تەواو دەکات، پاشان لای جەنابی مامۆستا مەلا ساڵح لە ساڵی (١٩٥٣)دا ئیجازەی مەلایەتی وەردەگرێت.[٢]

هەر لەو ساڵەدا لە تاقیکردنەوەیەکی ئەوقافدا بە پلەی باش دەردەچێت.

لەبەر زیرەکی و باوەڕی پاکی، مامۆستا مەلا عومەر عەبدولعەزیز خاتوو نەجیبەی کچی پێدەبەخشێت، حاجی مستەفای تەپی سەفاش مەسرەف دەکێشێ و لە دێی تەپی سەفا دەیکاتە پێش نوێژ لەسەر مەسرەفی خۆی مزگەوتێك و ماڵێکی بۆ دەکاتەوە، مامۆستا لەتەپی سەفا حوجرەیەك دەکاتەوەو بڕیار دەدات لە (دە) فەقێی زیرەك زیاتر وەرنەگرێت، ئەویش دوای تاقیکردنەوەیان، یەکێك لە وانە جەنابی مامۆستا مەلا عومەر رێشاوی بوو_خوا لێی خۆشبێت_ مامۆستا عومەر بۆی گێڕامەوە:(من خۆم وانەی (منطق)م لا خوێندووە، ئاسۆیەکی وای تیا بوو کە هەموو کەس لێی حاڵی دەبوو، یەکێك بوو لە وانەی کە تەواو حاڵی بوو بوو لە زانیارییەکانی حوجرە، کە هەتا ئێستا زۆربەی مامۆستاکان نەچوونەتە ناوەڕۆکی، یەکەم کەسێك بوو _ لەسەر دەمی خۆیدا_




له ریزی خوێندکارانی مزگەوتدا كه موناقەشە لەگەڵ مامۆستای خۆیدا بکـــات، فـــەقێی زیرەکــــی خۆشدەویست پشتگیری چـاكی لێدەکـــرد، کتێبخانەیــــەكی دەوڵەمەندی هه بوو كه زۆربەی لاپەڕەکانی بە حاشییەو پەراوێز رازاندبـوّوە، عیلمێکی تـەحقیقی هەبوو، لەو عالمانه بوو كه هەمیشه پەرەی بە زانیارییەکەی دەدا، ئەگەر ژیانی خاڵی بکردایە بۆ زانست و تەمەنی بەدەمییەوە بوایە خوا باشتر دەزانێ_ دەبوو بە یەكەم زانای ناوچەکە،.. له گفتوگۆدا زۆر نەرم و لەسەرخۆو خاوەن بەڵگە بوو، گەر نیازی بوایە قسەبکات، پێشەکییەکی باشی بۆ دەچنی، ئینجا دەچووە باسەکەوە بێئەوەی بیرکاری خوێندنێ بووبووە مامۆستای بیرکاری و له ماڵی خۆیدا دەیووتەوە بە هەندێ کەس که منیشی تێدا بووم. گەلێ شارەزایی لە زمانی عەرەبیدا هەبوو، بە جۆرێك كه دەشیا ببێتە عەمیدی زمانی عەرەبی).[3]

لەبەر ئەوەی تووشی نەخۆشی دەبێت لەشارەزوور، ساڵی (١٩٥٩) دەچێتە خولی پەروەردەو بە پلەی دووەم دەردەچێت و[4] لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە مەلایانی ئەو سەردەمە دەبێتە مامۆستای قوتابخانە، بەڵام واز له پیشەی مەلایەتییەکەی ناهێنێ هەتا مردن هەر خەریکی دەبێت و زانستە ئایینییەکان فێری خەڵکی دەکات، هەر لەسەرەتای پەنجاکانەوە بە بینینی هەندێ زانای وەك ئەمجەد زەهاوی و مەحمود سەواف فیکری حەسەن بەنا هەڵدەبژێرێ‌و دەبێتە یەکێك لە ئەقتابی بریان له کوردستاندا، بەڵام ئەوەندە نەژیا هەتا هەموو لێهاتنە شاراوەکانی بکەونە کارو بەرهەمیان زیاتر ئاشکرا ببێت.

لە شەوی پێنج شەممە رێکەوتی٢٢_١٩٧٦/١٢/٢٣ لە تەمەنی (٤٨) ساڵیدا وەفاتی کرد، سەدان مامۆستاو قوتابی بۆ گەیاندنی بیرۆکەکەی بۆ دوای خۆی پەروەردە کرد...

## بەرهەمەکانی:

١. نمونەیەك لەئیسلام- یەکەم بەرهەمیەتی- ٩٢ لاپەرەیە، ساڵی ١٩٦٨ چاپ کرا.
٢. پێنج پایەکانی ئیسلام- ١١٦ لاپەرەیە ساڵی ١٩٦٩ چاپ کرا.
٣. لە دەروازەی ئیسلامەوە- ١٧١ لاپەرەیە ساڵی ١٩٧٣ چاپ کرا.
٤. ژیانی پێغەمبەری مەزن- ٥٠٣ لاپەرەیە ساڵی ١٩٧٣ چاپ کرا.
٥. پاشکۆی ژیان- ١٥١ لاپەرەیە ساڵی ١٩٧٩کە ئامادە بوو دوای خۆی چاپ کرا.
٦. خێزانی بەختیارو کۆمەڵی کامەران- ٧٢ لاپەرەیە ساڵی ١٩٧٥ چاپ کرا.
٧. کورێکی لاسارو باوکێکی هەژار- له ئێران ساڵی ١٩٩٣ چاپ کرا.
٨. ئیسلام بەرنامەی ژیان- بەراوردێکە لەنێوان بەرنامەی سەرمایەداری‌و سۆشیالیستی‌و ئیسلام- دەست نووسە.
٩. ئیسلام کارە نەك تەمەڵی- دەست نووسە.
١٠. دوو خەربزە بە دەستێ هەڵناگیرێ- دەست نووسە.

## ئەم بابەتانەشی بە زمانی عەرەبی بڵاوکردۆتەوە

١. اصناف الناس في مقايس القرآن- مجلة التربية الاسلامية عدد (٧) سنة ١٩٦٨.
٢. البابية والبهائية- مجلة التربية الاسلامية عدد (١٠) سنة ١٩٦٨.
٣.الوعض والابتعاض- مجلة التربية الاسلامية عدد (٥) سنة ١٩٧٠.
٤. الاسلام والمرأة/مجلة التربية الاسلامية سبعة أقسام الاعداد (٥-٦-٧-٨-٩-١٠-١١) سنة ١٩٧٠.

سەرچاوەکان

١. کوردو کوردستان _ محەممەد ئەمین زەکی لاپەرە (١٢٣).
٢. رۆژنامەی یەکگرتوو ژمارە (٢٢)ساڵی ١٩٩٤ بابەتێك بە ناوی مامۆستا پارەزانی لە بیرەوەری قوتابی‌و هاورێکانیدا.
٣. گۆڤاری پەیامی راستی ژمارە (١٠) ساڵی ١٩٩٢ وتووێژێك لەگەڵ مامۆستا عومەر رێشاوی لە سەر مامۆستا پارەزانی.
٥. ژیانی پێغەمبەر _ لاپەرە (٥) بە پێنووسی مامۆستا مەلا عوسمان.




## مامۆستا شێخ عەبدوڵلای گردە سۆری

# زانایەکی بەرزو مرۆڤێکی دڵفراوان

دواندنی: جەعفەر گوانی

هەر کاتێك لە دانیشتنێکی مامۆستایانی ئایینی دانیشتیو، کرا بە باسکردنی ئەو مامۆستا بەڕێزانەی بە درێژایی تەمەن لە خزمەتکردندا بوونە، ناتوانرێت مەجلیسەکە بێدەنگ بێت، بەبێ ئەوەی ناوی مامۆستا ( شێخ عەبدوڵلای گردە سۆری ) تێدا نەکرێت. هەر بۆیەش بەئەرکی سەرشانی خۆمان زانی بچینە خزمەتی ئەو مامۆستا بەڕێزەو، هەندێك پرسیار بخەینە بەردەم بەڕێزیان. کاتێك لەگەڵ مامۆستا دەکەویتە گفتوگۆ کە لە تەمەنی ( ٨٢ )ساڵی دایە، بەڵام نەك وەك زۆرێك لە هاوتەمەنانی. مرۆڤێکی کراوە، رووخۆش، دەم بەزەردەخەنە، هەر چەندە لەلای دابنیشی حەز دەکەیت زیاتر دانیشیت، لەهەمووش گرنگتر ئەو بێنەفس و ملکەچییەی مامۆستایە، خۆی لەو تەمەنەدایە، بەڵام هەر کەسێك بچێتە ماڵی حەزدەکات لە خوارووی دابنیشێت و خزمەتی بکات. ئێستا مامۆستا لە گەڕەکی ( مەنتکاوە ) لەشاری هەولێری پایتەخت دادەنیشێت و، رۆژانەش لە مزگەوتی مەلا ئیسماعیل ئاغە کەلی وانەی زانستە شەرعییەکان بەفەقێیان دەڵێتەوە، بەبێ ئەوەی لەبەرامبەر ئەم کارەدا هەست بە ماندووبوون بکات. هەروەها هەموو رۆژانی سێشەممە لە مەکتەبی تەنفیزی یەکێتی زانایانی ئایینی ئیسلامی کوردستان لە لیژنەی فتوا بالا دادەنیشێت و، خەریکی چارەسەرکردنی کێشەو گرفتی هاوولاتیانە. ئێستاش خوێنەری بەڕێز لەگەڵمان دابە لەو گفتوگۆیەی کە لەگەڵ بەڕێزیان ئەنجاممان داوە:





***مامۆستا ئەگەر کورتەیەك لە ژیانت باس بکەیت؟**

– ناوی سیانیم (عەبدوڵڵا سلێمان محەممەد)ە لە ساڵی ١٩٢٠ی زاینی لە گوندی (چارەگردەڵە) لەدایك بوومە، خۆشمان سەیدین پێمان دەگوترێت (سەیدی پیر خدری) بە حوکمی ئەوەی باوکم لە خوێندنی مەلایەتی شارەزابوو، تاکو دەگاتە کتێبی (مختصر المعاني) خوێندبووی، لە تەمەنی سێ ساڵی هەر لەلای باوکم هێدی هێدی ئەلف و بێی پێدەگوتم، دوایی وای لێهات قورئانی پێتەواو کردم، پاش قورئان خوێندن هەندێك کتێبی فارسیشی پێگوتم، بەڵام هەر فێری خوێندنەوەی دەکردم، نەك مانا لێکدانەوە، چونکە نەیدەویست ئەرکی سەرشانم قورس بکات. دوای ئەوە بۆ خوێندن چوومە (کۆیە)، لەوێ لەلای خاڵم بە ناوی (مەلا محەممەد مەلا ئیبراهیم) دەمخوێند، بەهۆی خاڵایەتی زۆربەی کات لە ماڵی ئەو بووم، یەکەم کتێب کە دەخوێندرا (تصريف الزنجان) بوو، ئینجا مەتنی موغنیو جامیو سەید عەبدوڵڵا و تاکو فناری لەلای خاڵم خوێندم، بەڵام زۆر بە ئازار بووین، چونکە منداڵ بووین و، لەماڵەوە دەرچووبووین و، دەبوایە هەموو ئەو کتێبانەشمان لەبەر بکردبان، بۆیە مامۆستا زۆرمان پێوە ماندوو دەبوو، دوای ئەوە هاتمە لای مامۆستا (مەلا شەریفی مەنتك) لە گردە سۆر کتێبی (سیوطي)م خوێند، هەتا گەیشتمە (شرح الشية) لەلای مامۆستا مەلا عومەر ناسراو بە مەلا عومەرە رەش لە قەشقەی دەم خوێند، ئینجا بۆ (شرح العقائد) چوومە لای مامۆستا مەلا عوسمان لە گوندی (دۆرەزەی). پاش ئەویش چوومە دیبەگە لەلای مامۆستا مەلا سمایلی جدیدەی (مطول ومير ابو الفتح)ی ئادابم خوێندن، دوای ئەویش چوومە لای زانای گەورە مامۆستا (مەلا ئەبو بەکری کۆیی) ئەو کتێبانەم لەلا خوێندن: (تهذيب الكلام، جمع الجوامع، قازی، تشريح الافلاك)، دوای ئەوەی کە لەخزمەت ئەو زانا بەرزە کتێبەکانم تەواو کردن، هاتمە خزمەت مامۆستا شێخ مستەفا نەقشبەندی هەولێریّ هەرچەندە کە هاتم خوێندنم تەواو کردبوو، تەنها هەندێك (تحقيقات عامة)م لەلای خوێند، ئەنجا لەساڵی ١٩٤٤-١٩٤٥ لەخزمەت شێخ بڕوانامەی زانستی (الاجازة العلمية)ەم وەرگرت.



*** باشە کە خوێندنت تەواو کرد یەکەم پرۆژەت چی بوو؟**

– هەر دوای ئەوەی ئیجازەی عیلمیم وەرگرت یەکسەر فەقێم راگرتن و، دەستم کرد بە وانە گوتنەوە، هەر بەردەوام بووم تا ساڵی ١٩٥٨ کە عەبدولکەریم قاسم هاتە سەر حوکم و دەسەڵاتی عێراقی وەرگرت، لە دەرس گوتنەوە دابڕام، چونکە

# ئاغاو براگەورەکانی گوند لەبەرامبەر مەلایاندا زۆر ملکەچ و بەڕێز دەیانڕوانین

ئەو هەوڵی تەواوی خستبووە کار بۆ ئەوەی خوێندنی حوجرەو فەقێیەتی نەمێنێت، تا ئەوەی فەقێ هەبوو خوێندەوارییەکی زۆر کەمی هەبوو، یان تاکو (الاظهار)خوێندبووی دەیکردە مامۆستای سەرەتایی، مەبەستیشی تەنها نەهێشتنی ئەم خوێندنەبوو (کە بەدرێژایی مێژووی کورد هەر هەبووە) وەك گوتم لەو کاتییەوە لە خوێندن دابڕام تا (دوای راپەڕین) ئەوەبوو جەماعەتی یەکگرتوو لە مزگەوتی مەلا عەبدوڵڵای فەرهادی دەرسیان بۆ کردینەوە، لەگەل مەلا عەبدوڵڵا دەرسمان دەگووتەوە. پاشانیش لە مزگەوتی قازی شێخە رەشکە دەرسم دەگووتەوە، ئەویش هەر لەلای یەکگرتووەوە رێکخرابوو، ئێستاش ئەوە بۆ سێ ساڵ دەچێت لە مزگەوتی مەلا ئیسماعیل نانەکەلی دەرس دەڵێمەوە.

*** مامۆستا چ کاتێك ژنت هێنا؟**

– دوای ئەوەی ئیجازەی مەلایەتیم وەرگرت ماوەیەکی پێچوو ژنم هێناو. دوای ئەوە یەکەمجار لە (بەردە سپی) ماوەیەك مەلایەتیم کرد، دوای ئەوە تاکو ساڵی ١٩٧٣ لە گردەسۆر (پەیمانگای خوێندنی ئیسلامی)م هەبوو کە حکومەت بۆی کردبوومەوە، چونکە دوای تەواوکردنی خوێندن بە ئامۆژگاریکار (الواعظ) دامەزرام. چوومە کۆیەو لە پێشبڕکێدا سەرکەوتم، یەکسەر دوای ئەوە لە مزگەوتی مەحمود ئاغا لە کۆیە بە ئیمام دامەزرام و لەوێ پەیمانگام بۆ کرایەوە، تاکو ساڵی ١٩٦٧ کە شەڕی جولەکەو فەلەستین دەستی پێکرد، خەڵکی گردەسۆر داوایان لە دەوڵەت کرد من بۆ گردەسۆر بگوازێتەوە، کە گواسترامەوە پەیمانگاشیان بۆم هێنایە گردەسۆر، بەڵام قوتابیان کەم بوون لە ساڵی ١٩٧٣ گوتیان: دەبێت پەیمانگا بێتەوە هەولێرو لەگەڵ پەیمانگای خوێندنی ئیسلامی هەولێر تێکەڵاو بکرێتەوە. منیش ماڵم هێنایە هەولێر و سێ ساڵ لە (معهد الاسلامی) خەریکی دەرس گووتنەوە بووم. ئەو پەیمانگایەش کە لە گردەسۆر کرایەوە تەنها سێ قۆناغ بوو.

*** کەواتە چ بەراوردێك لەنێوان خوێندنی رەسمیو خوێندنی ئەهلی دەکەیت؟**

– بەڕای من خوێندنی ئەهلی زۆر سودبەخشترە، چونکە هەر چەندە ژیان لەو وەختی ئێمە زۆر سەخت و ناخۆش بوو، چونکە هەمووی لەسەر شانی خەڵکی بوو، بەڵام زۆر سوورتر بوون لەو سەردەمەی ئێستا کە فەقێیان خزمەتی زۆریان دەکرێت و، هەریەکەو نیمچە هاوکاریەکیشیان دەکرێت، پێم باشە فەقێ لەنێو ئەم ژیانە باشە دابێت، کەچی بەچاکیش ناخوێنێت. دەبوایە فەقێیانی ئێستا زۆر زیرەکتر بوونایە.

*** هەڵوێستی خەڵکی لەبەرامبەر ئێوەدا چۆن بوو؟**

– خەڵکی کوردستان زۆر رێزیان دەگرتین و، بەتەواوەتی هاوکاریان دەکردین، تا ئەوەی ئاغاو براگەورەکانی گوند لەگەڵ ئەوەشدا کە دەسەڵاتیان زۆر دەڕۆیشت، لەبەرامبەر مەلایاندا زۆر ملکەچ و بەڕێز دەیانڕوانین، تا ئەوەی جاری وا هەبوو مەلا زۆر قسەی پێدەگوتن، لەبەرامبەردا بێ دەنگ دەبوون.




*** چەند منداڵت هەیە؟ ئایا هیچیان جێی ەنابت دەگرنەوە؟**

– سێ کوڕو سێ کچم هەیە، دوو لە کوڕەکانم لە ائیرەی کارەبا کاردەکەن، یەکیشیان مدریسی مانی عەرەبییە، سەبارەت بەمەلایەتیش بەراستی ۆرم حەز دەکرد یەکیان بووبا بە مەلاو، زۆر هەوڵم ەگەڵ دەدان، بەڵام بەهۆی ئەوەی ئەو کاتی ماڵم لە وندی گردەسۆر بوو،نەیانتوانی بخوێنن، چونکە ەنها بوون و، هیچ لە منداڵەکان لەگەڵ واندا اوپیشە نەبوون، هەر بۆیە نەیانخوێند.

*** ئەی مامۆستا ئێستا خەریکی چیت؟**

–رۆژانە لە مزگەوتی مەلا ئیسماعیل نانەکەلی ەدریس دەکەم و، هەروەها ئەندامی لیژنەی فتوای لاشم لە مەکتەبی تەنفیزی یەکێتی زانایان، کە ەموو رۆژانی سێ شەممە دادەنیشین و خەڵکێکی ۆریش دێتە لامان بۆ چارەسەرکردنی ێشەکانیان.

*** باشە لە لیژنەی فتوای باڵا، بەزۆری چ ێشەیەك دێتە لاتان؟**

– هەموو جۆرە کێشەیەك دێتە لامان، بەڵام ۆربەی ئەو خەڵکانەی دێنە لامان کێشەی تەڵاق و براتیان هەیە.

*** بەرای تۆ کێشەی تەڵاق زیاتر لە یاوانەوەیە یان لە ئافرەتانەوەیە؟**

– پیاوەکان زۆربەی دەیخەنە مل ژنەکانیان، ەڵام وانییە، هەردوو لا خەتایان هەیە، کەچی زۆر یان لە مل مێردەکانەوەیە، مێردەکان دەیانەوێت ن وەك بەندەیەك بێت لەژێر دەستیاندا، خۆ ژنیش ەبد نییە، لە کۆمەڵگای کوردەواریدا مێرد مادەیە سەد قسە بە ژنەکەی بڵێت، بەڵام ئامادە یە یەك قسەی لێ قبوڵ بکات و لێی ببورێت، باشە خۆ ئافرەتیش ئادەمیزادە، بۆ لەبەرامبەر شتێك پەنا بۆ تەڵاق دەبەیت. پێویستە ژن و مێرد هەردەم لەگەڵ یەکدی بەلێبووردەبن و، لێکحاڵی بوونیان لەبەیندا هەبێت. ئەوەتە پێغەمبەری سەروەرمان(د.خ) خۆی لەبەرامبەر ژنەکانیدا زۆر لێ بووردە بووە.

*** هیچ پەیوەندیت لەگەڵ دادگا هەیە؟**

– بەڵێ پەیوەندیمان زۆر باشە، زۆربەی ئەوانەی دەچنە دادگا رەوانی لای ئێمە دەکرێن و، داوای تەئیدی ئێمەیان لێ دەکرێت، ئینجا دادگا بڕیاریان لەسەر دەدات، کەچی هەشە رەوانی لای ئێمەی ناکەن، بەڵام پەیوەندیمان باشە.

*** ناخۆشترین و خۆشترین کات بەلاتەوە؟**

– بەلای من سەردەمی عەبدولکەریم قاسم ناخۆشترە لە کۆڕەویش، چونکە ئەو هەموو هەوڵێکی لەدژی دین بوو، دەیویست شوعیەت بەنێو خەڵکدا بڵاوبکاتەوە خەڵکێکی زۆریش بۆ بەرژەوەندی خۆی دەچووە ڕیزی ئەوان، جگە لەو وەختە تێکڕای ژیانم باش بووەو، بەشێوەی ئاسایی ژیاوم و، تووشی هەژاری نەهاتووم، هەروەها

**نەقەراج و نەکەندێناوە و تاکو دەگەیشتە لینگاوە تاکە عەرەبێکی لێنەبوو**




تووشی نەخۆشی گرانیش نەبوومە.

*** لەساڵی چەند باوکت وەفاتی کردووە؟**

- باوکی من لەساڵی ١٩٧٢وەفاتی کرد.

*** تا ئێستا مامۆستا حەجی کردووە؟**

- بەڵێ لەساڵی ١٩٥٨ لەکاتی هاتنە سەر دەسەلاتی عەبدولکەریم قاسم، چوومە حەج لەو کاتەی واجباتی حەجمان تەواوکرد، دەڵێن: مرۆڤ حەزدەکات زوو بگەڕێتەوە ناو خزمانی، بەڵام من بەپێچەوانەوە پێم ناخۆشبوو، چونکە عەبدولکەریم قاسم فەسادی زۆری بڵاوکردبۆوە. لەو جارە زێتر نەچوومە، چونکە نەمویستووە بە بەدەل بچم، خۆشم ئەو توانایەم نەبووە.

*** مامۆستا بەبیری تۆ قەراج عەرەبی لێ هەبوون؟**

**لەو هەولێرەدا کوردو تورکمان برایەتییەکی زۆر باشیان هەبووە**

- من لەو کاتەی فەقێ بووم لەلای مامۆستا مەلا عوسمان دەمخوێند، نەقەراج و نەکەندێناوە و تاکو دەگەیشتە لینگاوە تاکە عەرەبێکیشی لێ نەبوو، هەروەها لەوکاتیدا مەخمور تاکو دەگاتە (سلطان عولا)ش تاکە کەسێکی عەرەبی نەبوو، هەمووی هەر کورد بوون. ئەو تەعریبەش لەساڵی ١٩٦٣ دەستی پێکرد، ئەو بەعسە هێدی هێدی شوێنەکانی دەکردنە عەرەب، نیازی وا بوو ئێرەش بکاتێ، هاتنە گردەسۆڕیش لەوێ مەڕو ماڵاتیان لەخەڵکی تاڵان کرد، بەڵام چەند کەسێك نەیانهێشت، وەك گوتم: بە فکری من نەقەراج و لەکەرکوکیش تاکو (دوز)یشی لەگەڵ دابێت، هەمووی هەر کورد بوون. ئێستاش کارەکەیان زۆر توونـد تـر کـردوە، ئەوەتە بەر لە ئێستا براێکم لە (چۆمە زەردەڵە) ئەفسەرێکی دەگاتێو، ئەفسەرەکە دەپرسێت: ئێوە نێوانتان لەگەڵ عەرەبەکاندا چۆنە؟براکەم لە وەڵامدا گوتبووی: نێوانمان باشە. لە وەڵامدا ئەفسەرەکە بە براکەم دەڵێت: ئەگەر باش نەبن دەرتان دەکەین و دەبێت ئێرە بەجێ بهێڵن. لەکاتێکدا ئەو شوێنە زۆر لێرە نزیکە.

*** چ شۆڕشێکت بەبیرە؟**

- وەڵڵا تەنها شۆڕشی مەلا مستەفای بارزانی، شۆڕشەکانی دیکەم بەفکر نین.

*** ئەی پەیوەندیت بە یەکێتی زانایان؟**

- پەیوەندی کردنی من بۆ پێش راپەڕین دەگەڕێتەوە، لەو کاتییەوە هاتومەتە ناو یەکێتی زانایان، ئەویش لەکاتی لە ژیاندا بوونی مەلا عەبدولڕەحمانی هەمزە کۆری بوو. لەپێش راپەڕین زۆر داوایان لێدەکردم بۆ ناو زانایەکانی بەعسی، بەڵام بەهیچ جۆرێك لێیان نزیك نەکەوتمەوە.

*** تۆ وەك مامۆستایەکی شارەزاو دونیا دیتە، چ ئامۆژگاریەکی فەقێیانی ئەمڕۆ دەکەیت؟**

- ئامۆژگاری من بۆ فەقێیان ئەوەیە بەباشی بخوێنن و، خۆیان تەنها بە خوێندن خەریك بکەن و، عیلاقەیان بەهیچ شتێکی دیکە نەبێت، با ئێمەی کورد وەکو عەرەبەکانمان لێ نەیێت، کە هەر کەسێك وتاری هەینی خۆشەویست دەڵێن: مەلایەکی زۆر زیرەکە، بێ ئەوەی لە عیلمدا هیچ شارەزاییەکی هەبێت. بابخوێنین بەڵکو هەندێکی وەك زانایانی





کۆنمان لەنێو هەڵدەکەوێتەوە. چونکە زۆر جێی داخە کە ئەو زانستە شەرعیانە بەفیڕۆ بچن.

*** مامۆستا ئەوەی جەنابت بەبیرتە بەینی کوردو تورکمان چۆن بووە؟**

– ئەوەی ئەمن بەبیرم بێت لەو هەولێرەدا کوردو تورکمان زۆر بەبرایانە پێکەوە دەژیان، هیچ ناخۆشیی و عەداوەت و دوژمنکاریان لەنێوان نەبووە، برایەتییەکی زۆر باشیان هەبووە.

*** هاوتەمەنەکانت؟**

– مەلا عومەری کەوری زۆر لە من بەتەمەنترە، ئەوانەی لەتەمەنی من بن:

١. مەلا عەبدوڵڵای فەرهادی

٢. مەلا سەید محەممەد سەید ئیسماعیلی مزگەوتی فرقان.

*** لە مامۆستایانی پێشوو بەکامەیان زۆر موعجیبی؟**

– لە عیلمدا زۆر بە مامۆستا مەلا ئەبوبەکری کۆیی، چونکە نازانم ئەو مستەواو ئاستەی لەکوێوە هێنابوو، هەر هەموو عیلمەکان بەلای ئەوەوە بەدیهی بوون، لەهەمووش سەیرتر ئەوەبوو مامۆستا لەگەڵ ئەو هەموو زانایییەیدا هیچ کتێبەکی نەبوون. لەکاتی فەقێیەتیشدا هەر وا زیرەك بووە. تا ئەوەی زۆر جاران مامۆستا مەلا قادری کانی دەربەندی کە مامۆستایەکی زۆر زیرەکە ئێستا لە کۆیەیە وەك نوکتەیەك دەیگێڕایەوە و دەیگوت: من و مەلا ئەبوبەکری کۆیی و چەند فەقێیەك لەلای شێخ تەهای بالیسانی دەمانخوێند، هەموو رۆژێك بۆ سەعی کردن دەچووینە ناو باخچان، هەر کە دەچووین ئێمە دەستمان بە موتاڵاکردن دەکرد، مەلا ئەبوبەکریش دەچوو قازی لەبن سەری خۆی دادەنا و لێدەکەوتە خەوێ، کە دەگەڕاینەوە حوجرە لەهەر هەموومان ئاگادارتربوو لە باسەکە. بەڵام لەرووی تەقواوە زۆر بە مامۆستا مەلا شەریف موعجیبم، چونکە مامۆستایەکی زۆر زۆر بەتەقوابوو، نەمدیووە وەکو ئەو، لەگەڵ ئەوەشدا لە علمیشدا زۆر شارەزا بوو.

*** چۆن پێناسەی (مەلا) دەکەیت؟**

– مەلا جێگری پێغەمبەرە (د.خ) لەهەموو کەسێك گەورەترە ئەگەر ئەرکی خۆی بناسێت و پێی هەڵبستێت.

**مەلا لەهەموو کەسێك گەورەترە ئەگەر ئەرکی خۆی بناسێت**

*** ئەی جگارەکێشان؟**

– شتێکی زۆر زۆر خراپە...

*** ئەی سیواك؟**

– سونەتێکی زۆر گەورەیە، هەروا بۆ تەندروستیشت باشە، بەڵام ئێمە بۆ خێرەکە دەیکەین.

*** ئەی کیمیا بارانی هەڵەبجە؟**

– زوڵمێکی گەورەیە لە خەڵکێکی بێتاوان، چونکە لەتێکڕای ئایینە ئاسمانییەکان و، لەویژدانی مرۆڤە پاك و بێگەردەکانیش شتێکی وەرنەگیراوە. ئەوەتە دەولیەن قەدەغەیە. ئەوە چ ویژدانێکە لە رقی چەند کەسێك بکەوێتە گیانی چەندین خەڵکی بێتاوان، چ جا ئەگەر ئەم خەڵکە موسڵمانیش بن.





*** ئەی کۆچڕەو؟**

– کاتێکی ناخۆش بوو، لێرەوە تاکو خانە(پیرانشار) ڕۆیشتم.

*** ئەی ڕاپەڕین؟**

– زۆر پێی دڵخۆش بووم، چونکە دەرچوون بوو لەدەست غەدرو ستەم، بەڵام حەزم دەکرد زیاتریش بوایە.

*** ئەی هەستی نەتەوایەتی؟**

– سنوردارە، ئیسلام دەیەوێت بەبرایانە هەموو نەتەوەکان پێکەوە بژین. کەچی ئەمڕۆ نەتەوایەتی بووەتە هۆیەك بۆ ڕزگاربوون، ئێمە کوردین لەبەر ئەوەی کوردین عێراق و تورکیاو ئێران و زوڵمان لێدەکەن و دەمان چەوسێیننەوە. بەنەتەوەی خۆیان حیسابمان ناکەن، بەکوردیش دەمانکوژن.

*** چ شتێك زۆر بەلات ناخۆش بووە؟**

**ڕاپەڕین دەرچوون بوو لەدەست غەدر و ستەم**

– مردنی مەلا محەممەدی خاڵم لەساڵی ۱۹۷۳.

*** چەند ژنت هێناوە؟**

– یەك ژنم هێناوە خزمی خۆمە.

*** بیرت لە دووژنی نەدەکردەوە؟**

– نەخێر دەمویست تەنها ژنێکم هەبێت، بەڵام دوور لە کێشە بژین. بەتایبەتی کاری مەلایەتی خۆی گرانە.

*** خوا خێرت بنووسیۆ سوپاست دەکەین:**

– بەخێر بێن سەرچاوم.

**ئێمەش دەڵێین: ئەو مامۆستایەو چەندینی وەك ئەویش ئەرشیفێکی گەورەن، بۆ شوێن و ساڵانی تەعریب، هەق وابوو لەو بارەوە زۆر بە درێژی قسەیان لەگەڵ بکرابا بۆ بەڵگەو شاهیدی مێژوو.**

---

**پێشەوا غەزالی بەم شێوەیە ڕەوشت باس دەکات:**

**بەڕووی گەش گفتوگۆ بکە، زۆر ئەم لاو ئەولا مەکە، خۆت لەکاری خەڵك مەقورتێنە، یاری مەکە بەپەنجە، ڕیش، ددان، کەپو، کۆکە، باوێشك . . .**

---




# شاندی باڵای حەج



**دوای ئەوەی شاندی باڵای حاجیانی کوردستان لە جێبەجێ کردنی فەریزەی حەج گەڕانەوە بۆ کوردستان. بەمەبەستی زیاتر شارەزا بوون لە ڕێورەسمی سەفەرەکەو چۆنیەتی جێبەجێ کردنی ئەم ئەرکە. گۆڤاری خۆری ئیسلام بە چاکی زانی دیدارێک لەگەڵ بەڕێز ( شێخ مەئمون بریفکانی ) سەرۆکی شاندەکە ساز بدات.**

**خۆری ئیسلام: وەفدی ئەمساڵ لەرووی چەندایەتیو چۆنایەتی ڕێکەوتەوە چۆن دەنرخێنن؟!**

**مەئمون بریفکانی:** وەفدی ئەمساڵ پێکهاتبوو لە(٥) کەس لە جۆرەها توێژی کۆمەڵ و لە گشت ناوچەکانی هەرێم بوون.

**خۆری ئیسلام: حکومەتی هەرێمی کوردستان چ ئاسانکارییەکی سەبارەت بە بەڕێ کردنتان بۆ فەریزەی حەج ئەنجامدا؟**

**مەئمون بریفکانی:** حکومەتی هەرێم خەرجی ناردنی وەفدەکەی لە ئەستۆ گرت لە ڕێی تورکیاوە تاکو وڵاتی سعودیە بەخەرجی ئەو ماوەیەش کە لە تورکیا بووین. هەروەها کرێی سەفەر کردن بە فڕۆکە لە چوون و هاتن و ئاسانکاری کارەکانمان لە لایەن نوێنەرایەتیمان لەوێو بەو بۆنەیەوە ڕێزو سوپاسی خۆمانیان پێشکەش دەکەین بۆ ئەو ئاسانکاریانەی کە بۆ ئێمەیان ئەنجامدا.

**خۆری ئیسلام: لەلایەن بەرپرسانی عەرەبستانی سعودیەوە چۆن پێشوازیتان لێکرا؟**

**مەئمون بریفکانی:** پێشوازی لێکردن وەکو وەفدەکانی پێشوو تر ڕێك و پێك و باش بوو بە دابین کردنی هەموو پێداویستییەکی گواستنەوەو هاتووچۆو نیشتەجێ بوونمان لە شاری(مكةالمكرمة) لە کۆمەڵگایەك بوو تایبەت بە میوانانی(خادم الحرمين الشريفين)، هەروەها لە شاری(المدينة المنورة) لە نایابترین میوانخانە کەتەرخان کرابوو بۆ میوانان دادەبەزین.

**خۆری ئیسلام: پەیوەندیتان بە وەفدو نوێنەرانی دەوڵەت و وڵاتانی عەرەبی چۆن بوو تا چەند توانیتان کێشەی گەلی کوردی کوردستانی عێراق بە میوانەکانی خوای گەورە بگەیەنن؟**

**مەئموون بریفکانی:** ڕۆژنامەگەری سعودیە چاوپێکەوتنێکیان لەگەڵم ئەنجامدا بەیەك لاپەڕەی تەواو لە ڕۆژنامەی (الرياض) کە ڕۆژنامەیەکی بەربڵاوەو لە ژمارە (١٢٢٩٦)ی ٢٠٠٢/٢/٢٢ بڵاو کرایەوە هەروەها لە پاڵ ئەنجامدانی مەراسیمەکان لە(مكة المكرمة)و(مدينة المنورة) چاومان بەگەڵ وەفدی ئیسلامیو عەرەبی کەوت ئەوەی جێگای دڵخۆشی بوو، کە زۆربەی وڵاتانی جیهان ئاگاداری کێشەی کورد بوون. زۆر گفتوگۆمان لەسەر کێشەی کوردو بارودۆخی کوردستان و مافەکانی گەلی کورد لە گەڵیاندا ئەنجامدا.

**خۆری ئیسلام: رای گشتی میوانانی عەرەبستانی سعودیە بەرامبەر کێشەی کورد چۆن بوو ئایا توانراوە دەنگی مەزلومیەتی کورد بگاتە ئەو شوێنە پیرۆزە.**

**مەئمون بریفکانی:** لەکاتی خستنە بەرچاوی کێشەی کورد بۆ هەموو ئەوانەی کە گفتوگۆمان لەگەڵیاندا ئەنجام دەدا وەڵامدانەوەو پشتگیری خۆیان نیشان دەدا چ لە وڵاتە عەرەبییەکان یا وڵاتە ئیسلامییەکان. هەندێکیان پشتگیریان لە فیدرالیەت دەکردو هەندێکیشیان پێشنیازی دەوڵەتێکیان بۆ کورد دەکرد، بە کورتی تێبینی ئەوەمان کرد کەوا ناوی(بارزانی) لەلای زۆربەی ئەوانەی کە چاومان پێیان کەوت ناوێکی ناسراو بوو.

# رێوڕەسمی دووەم

# سەفەری ڕەسمی حاجیانی

# کوردستان بۆ کەعبەی پیرۆز

سلێمان گەلاڵی- پەیامنێری ڕاگەیاندنی
وەزارەتی ئەوقاف بۆ عەرەبستانی سعودی



شاندی باڵای حەج لە وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی یاوەری حاجییە بەڕێزەکانی کوردستان بوون بۆ بەجێگەیاندنی مەراسیمی حەج لە هەردوو شاری پیرۆزی مەککەو مەدینە، بەدرێژایی ئەو سەفەرە پڕ خێروبەرەکەتە کەماوەی مانگێک زیاتری خایاند شاندی باڵا کە بە سەرۆکایەتی بەڕێز خورشید شێرە بریکاری وەزارەت بوو، پێکهاتبوو لە حاجی نوری قادر بەڕێوەبەری ئەوقافی هەولێر و سەیدا نەسرەت بەڕێوەبەری ئەوقافی دهۆك و شێخ قاسم بەرزنجی بەڕێوەبەری حەج لە دیوانی وەزارەت و بەڕێز مەلا محەممەد ئاکرەیی سەرۆکی یەکێتی زانایانی ئایینی ئیسلامی بوون، بەرۆشی خزمەتگوزارییەکانی ئایینیو دابین کردنی شوێن و ئارامی بوون بۆ حاجییە بەڕێزەکان و هەوڵی بەردەوامیان بۆ نەهێشتنی گیروگرفتە لاوەکییەکان دەدا.

هەر لەیەکەم ڕۆژی سەفەرکردن شاندی باڵا خەمخۆری یەکە یەکەی گرفتەکانی سەفەرو دابین کردنی ئامرازی سەفەرو ئارامی بوون بۆ حاجییە بەڕێزەکان، لەلایەکی تریش وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی چەندین مامۆستای پایەبەرزی دەست نیشان کردبوو بۆ ئیرشادکردنی حاجییەکان، لەوانە بەڕێز شێخ ئیبراهیم بالیسانیو مامۆستا مەلا عەبدوللا مەولودو مامۆستای دەنگ خۆش مەلا جەرجیس و مامۆستا عیسمەت. کە بەوپەڕی لەخۆ بردووییەوە وەڵامی پرسیارەکانی حاجیانیان لەهەر کات و شوێنێکدا دەدایەوە.





بەدرێژایی ڕۆژانی مەراسیمی حەج شاندی باڵا خەمخۆری حاجییە پەککەوتوەکانی بوو بۆ بەجێگەیاندنی ئەرك و سوونەتەکانی حەج و ئاگادارکردنەوەیان لەشوێن و کاتی یەکە یەکەی ئەرکەکان بۆ بەجێگەیاندنی بە جوانترین شێوە. لەلایەکی تر شاندی باڵا بەشداری کۆنگرەی ساڵانەی ١٣هەمینی کرد بەناونیشانی (لەناوبردنی تیرۆرو پاشەڕۆژی عێراق) کە بەڕێز خورشید شێرە بریکاری وەزارەت بەئەندامی دەستەی سەرۆکایەتی کۆنگرە دەست نیشان کراو چەندین وتار پێشکەش کران.

لەم کۆنگرەیە بەڕێز خورشید شێرە بریکاری وەزارەت چاوی بە بەڕێز محەممەد باقر ئەلحەکیم سەرۆکی ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی لە عێراق کەوت و چەندین بیرورا ئاڵوگۆڕ کران. کۆنگرەکە لە شاری مەککە بەڕێوە چوو ماوەی زیاتر لە دوو کاتژمێری خایەند.

ڕۆژی دواتر بەرەو مینا بەڕێکەوتین و دوای مانەوەی شەوێك چووینە گۆڕەپانی عەرەفەو لەژێر خێمەکانی عەرەفە بەڕێز خورشید شێرە وتارێکی بەپێزی پێشکەش بە حاجیان کردو سوپاسی خودای کرد کە چەپارەی داین بۆ بەجێگەیاندنی ئەو ئەرکە پیرۆزە. دوعای خێرو بەرەکەت و باڵادەستی بۆ حکومەت و پەرلەمانی کوردستان کرد. لە هەڵگەڕانی حاجیانی کورد بەچیای عەرەفە هەردەم دەست بە دوعا و نزا و پاڕانەوە بوون، کە کوردی ستەمدیدە لە گیروگرفتەکان ڕزگار بکاو حکومەت و پەرلەمانی کوردستان پایە بڵند و سەرفیراز بکات.

شاندی باڵاو حاجیانی کوردستان لە کەمترین دەرفەت خەڵکانی تریو موسڵمانیان دەهێنایە ئاخافتن و باسی کێشەی کوردو هەرێمی کوردستانیان بۆ دەکردن. بۆ نمونە لە مزگەوتی حەزرەتی عائیشە پیاوێکی میسری کە پیشەی پارێزەر بوو بۆمان دواو گوتی: ئێوەی کورد نەوەی سەلاحەددین ئەیوبی مافی خۆتانە شانازی بەوە بکەن، کە یەکەم ڕزگارکەری قودس سەرکردەیەکی کورد بووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەی شانازی بە کوردایەتی خۆتان دەکەن دەبێ شانازی بە موسڵمان بوونتان بکەن. هەروەها گوتی: جەمال عەبدولناسری سەرۆکی میسری کۆن دۆستایەتی پتەوی لەگەڵ کورد هەبووە ئەو دۆستایەتییە تاکو ئێستاش ماوە، کە میسرییەکان شانازی پێوە دەکەن.

دوا بەدوای تەواو بوونی مەراسیمەکانی حەج لە شاری مەککەی پیرۆز شاندی باڵای حاجیانی کوردستان لەشاری پێغەمبەر (د.خ) لە مەدینە چەند زیارەتێکی بۆ هەر سێ کۆمەڵ لە حاجیان ڕێکخست و شوێنە پیرۆزەکانی شەڕی ئوحد و خەندەق و مزگەوتی جووت قیبلە و قبا و حەوت مزگەوتی بە حاجیان ئاشنا کرد.

ئینجا لیستی حاجییەکانی گەڵاڵە کرد بۆ گەڕانەوەو لەدوا شەوی مانەوەمان لەشاری مەدینە بەڕێز خورشید شێرە لەگەڵ حاجیاندا کۆبووەوە وتارێکی پێشکەش کرد، کەتیایدا سوپاسگوزاری پێشکەش بەو حاجیانە کرد کە هاوکاری بوون و چارەسەری گیروگرفتە تایبەتییەکانی خۆیان بە خۆیان چارەسەر کردووە. بەڕێزیان دووبارە دوعاو نزاو پاڕانەوەی لەبەر خودای مەزن کرد کە کورد سەرکەوتوو بکات لە بەجێگەیاندنی مەراسیمە ئایینییەکان و حەج بەنسیبی کوردی موسڵمان بکات.





# تویژینەوە لەسەر فیقهی ئیسلامی

# هۆکارەکانی جیاوازی بۆچوونی زانایان لە فیقهی ئیسلامیدا

ئەڵقەی/ چواردەم

مەلا عبداللطیف باموکی

**تەقلید:** وشەیەکی عەرەبییە لەزمانەوانی عەرەبیدا بە مانای ملوانکە لەگەردنکردن هاتووەو لەزاراوەی فیقهیدا وەرگرتنی راوبۆچوونی کەسانی دیکەیە بێ بەڵگە بەمانا بەستنەوەی خۆی بە فەرمانی خەڵکیکەو، کارکردن بەقسەی ئەوەی گوتاری بەڵگەی شەرعی نییەو کارکردن بە فەرمایشی زانایەك، کە ئەزانی لەکێو چۆنی وەرگرتووە. لەکورتەی ئەم پێناسانەی سەرەوە تەقلید: بەمانای خۆ تەسلیم کردنە بێ بەڵگە بەراو بۆچوونی زانایەکی ناسراو یان نەناسراو و ئەگەر داوای بەڵگەت لێ کرا ئاگاداری بەڵگە خاوەن بیرورایەکە نازانی! ئەگەر رایەکی بەرامبەر هەبوو و بەرژەوەندی ئایینیو ژیانی تێدابوو دەتوانی گەردەنی خۆت ئازاد بکەیو وابەستە بیت بەرای تازە بێ بەڵگەو کۆڵینەوە.

بێگومان لەکاتی باسکردنی جیاوازی زانایان زۆر کێشەی زانایان باسکراوە بەرای زاناو رای بەرامبەریو (عەوام) کە هەرکەس پلەی موجتەهیدی نەبوو بە عەوام دەژمێری خۆی سەرپشکە لە گۆڕینی رێبازی ئەم زانا بۆ ئەو زاناو گوناهی نییەو لادان نییە لە فیقهی ئیسلامی، بەڵام لە رەشایی خەڵك جیانەبێت و نامۆو ناتەبا نەبێت لەگەڵ سەرجەم راوبۆچونەکانی تری ئەم زانا تازەو گوڵ بژێری نەکات هەرچی سوك و ئاسان بێت هەڵبژێریو رێبازێکی فرە رەنگ بۆ خۆی دیاری بکات، کە ئەم دروستتی گواستنەوەیە کێشەیەکی دوو دڵیو راراییی دروست کردووەو مرۆڤی موسڵمانی تووشی سەرلێشێوان



کردووە مەگەر ئەوانەی کە خودا روحمی پێکردوون و لەسەریەك رێبازی دیاری پەیرەو دەکەن و بەهەموو توانا هەوڵ دەدەن کە تەقلیدەکەیان لە رووی زانست و زانیاریو مەعریفە بێت.

کۆمەڵگەی موسڵمان کە تووشی لێك ترازان و پچڕ پچڕ بووە هۆکاری ئەم تەقلیدەیە و ئەم تەقلیدەش هەموو رووداوەکانی کات و شوێن و کەسیان چارەسەرکردووە لە فراوانی و سامانی داوە بە فیقهی ئیسلامی.





تەقلید لە ئیسلامدا کارێکی پەسەند نییەو زانایان کە دەفەرموون: (العامي لامذهب له) لەشێوازی بە کەم زانین و زەم دایە، چونکە شوێنکەوتنی بێ بەڵگەیە، تەسلیم کردنی ژێرییە بۆ بۆچوونی خەڵکانی تر جگە لە زیانی دەمارگیری بۆ ڕێبازێکی کە بێ بەڵگەو بەکارهێنانی عەقل و فام و هۆکار، هەر لەبەر ئەوەیە زانایان جیاوازن لە دروست بوونی (شوێن کەوتنی بێ بەڵگە) هەندێك دەفەرموون دروست نییەو دەبێ موسڵمانی موکەلەف هەموو هۆکارێك بەکار بێنی بۆ دۆزینەوەی بەڵگەی حوکمە شەرعییەکان، بەپێچەوانەوە هەندێك دەفەرموون بە ڕاشکاوی دروستە بۆ هەموو کەس. لە ڕاستیدا زەمی تەقلید و مەدحی تەقلیدو بەرگری کردن لەهەر لایەك ڕاست نییە، ئەوەی لەسەر موسڵمان فەرزە فەرمانبەرداری خودایەو پێغەمبەر(د.خ)، ئەوەش لە دەقی قورئان و فەرموودە ڕوونکراوەتەوە، کەواتە فێربوونی قورئان و فەرمودە بناغەی باوەڕی ئایینییەو ئەگەر حەشارگەو شاراوەی ڕاوبۆچوونی جیاواز هەبوو لە ڕێگەی هێزی ئەم دوو سەرچاوە کاری شەرعی ئەنجام بدرێ، ئەوە ئەگەر توانرا، خۆ ئەگەر توانا نەبوو بەپێی فەرمانی قورئان کە دەفەرمووێ: ﴿فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنْتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ/ النحل-٤٣و الانبياء-٧﴾ کەواتە لەناوچەکە یان هەرێم، هەر زانایەك کە زانیاری هەبێت دەبێتە مەرجەعی تەقلیدی خەڵك و بێ سەواد تەنها مەرجی ئەوەیە زانا بێت، خاوەن تەقواو پارێزگار بێت و بەرپرسیاری ئەو کارەی لە ئەستۆدابێت، بەڵام دەمارگیری و خۆبەستنەوەی کوێرانەو بەستەزمانانە نەبێت، کە ئەم شێوازە ڕەوشتی زانا بەرزەکان بووەو داوایان لە خەڵك نەکردوە کە شوێنمان بکەون، بەڵکو خەڵك ڕاکانیان پەسەند کردون و شوێنیان کەوتون و پاش خۆیان زانای سەر بەو ڕێبازە گەڕاوە لە شوێن بەڵگە بۆ بەهێزکردنی ڕاوبۆچوونی پێشەواکەی‌و نیشانی عەوامی داوەو کەم کەم پەیڕەوی مەزهەب زۆربووەو جیا بووەتەوە لە مەزهەبی دیکەو ڕێبازی دیکە.

لێرەدا بەروونی دەردەکەوێ کە ڕێبازەکانی فیقهی ئیسلامی قوتابخانەی زانستی شەرعی‌و فیقی ئیسلامی تەنهایەك کەس دامەزرێنەری نییەو دەیان و سەدان زانا بەشداریان کردووە لە دامەزراندن و گەشەکردن و ڕێکخستنیداو بەناوی یەکەم دامەزرێنەرەوە ناسراوە، کە موجتەهیدە گەورەکانی ناسراو بەزانست و هەوڵ و چاکی‌و پاکی‌و پەرهێز کاریەوە، هەندێك نەماوەو بەمردنی خاوەنەکەی ناوی کوژاوەتەوە مەگەر لەناو سەرچاوەکاندا ئاماژە بە ناویان بکرێ وەك ئەوزاعی، سوفیان سەوری و هەندێك هەتا ئێستە پەیڕەویان ماوەو خەڵك زۆرو کەم پەیڕەوی ڕاوبۆچوونەکانیان دەکات و ئەوەی کە نەتوانێ ئیجتهادی بکات دەتوانێ تەقلیدی ڕێبازێك بکات بە پەیڕەو لە زانایەکی شارەزا لە ڕێبازدا یان گەڕانەوە بۆ سەرچاوەکانی تۆماری ڕێبازەکە، بەڵام پەیڕەوی ئەم ڕێنومایانە بکرێت:

**یەکەم:** مەزهەبی ئیسلامی قوتابخانەی فکری ئیسلامییە، شیکردنەوەی دەقەکانی شەریعەتی ئیسلامییەو لەسەرچاوە وەرگیراوەو شەرعێکی جیاواز نییەو دورنییە لە ئیسلام و نامۆ نییە بەدەقەکانی قورئان و فەرموودەو قیاس و ئیجماع.

**دووەم:** شەریعەتی ئیسلام تەنها قورئان و سونەیە لە هەموو مەزهەبەکان گەورەترە و یەکە بەیەکەی ڕێبازەکانی هەموو ئیسلام نییە، بەڵام ئیسلام خۆی ماوەی بیرکردنەوەو ئیجتهادی داوەو ئەگەر ڕاست بوو یان هەڵەبوو.




سێیەم: دەقی شەریعەت بەڵگەیە لەسەر هەموو ڕێبازێك نەوەك ڕێباز بەڵگە بێت بۆ شەریعە، چونکە ڕاستیو دروستی ئەم ڕێبازانە لەبەر ئەوەیە پەیڕەوانیان بڕوایان وایە لە شەرع وەرگیراوە، خۆ ئەگەر دەرکەوت ئەو ڕێبازە یان ئەم ڕێبازە هەڵەیەو ڕاستی لایەنی ڕێبازێکیکەیە دەبێ بگەڕێتەوە بۆ ڕاستیو لەسەر هەڵە نەڕوات. ئەگەر لە هەمووش نەگەڕێتەوە لەو مەسەلەیەی کە گومانی تێدایە پاش گەزبێتەوەو، دوای هەواو هەوەس و شوێنکەوتنی کوێرانە نەکەوێ.

چوارەم: تەنگە نەفەس و هەناسە پچڕی نەبین ئەگەر ئەوجیاوازیەمان بەرچاوکەوت چونکە لە فام و ژیریو زیرەکیو هوشیاری جیاوازی هەیەو سروشتی مرۆڤەو نیشانەی نەمریو زیندووی فیقهی ئیسلامییەو، ئێمەش بەڕێزو قەدرەوە تەماشای ئەو زانا گەورانە بکەین، کەرێگەی دووریان نزیك کردووەو قورسیان ئاسان کردووە و ناویان هەمیشە بە گەورە ڕابگرین و داوای ڕەحم و پایەی بەرزیان لە خودا بۆ بکەین، ئێمەش وەك ئەوان بە ئەدەب بین بەرامبەر بە قورئان و فەرمودەو هەموو زانایانی زمانناسی عەرەبیو لە سەرووی

هەموویان خەلیلی کوڕی ئەحمەدی فەراهیدی (١٠٠-١٧٠ك) کە باسی فیقهی ئیسلامی دەکەن بە مانای (زانست لە ئایین)دا لێکی دەدەنەوە، واتە زانستێکی تایبەت بە ئایین و یاسای پەیڕەوکراوی ئیسلام و لە زاری زانای ئوسولیەوە زانست هەر کارێك کە حوکمی شەرعی ناو قورئان و فەرمووده ئیجماعی تێدا کۆکراوەتەوە ئەم سەرچاوەیە ئەم سێ بەڵگەیە لە خوداوە دانراوە بۆ خەڵك و ڕاوبۆچوون کاری بەسەرەوەنییە، بەڵام قیاس وەسفی حوکمە ئەسڵی حوکم نییە، کەواتە ڕاوبۆچوونی زانایەکی گەورە شەریعەت نییە، بەڵکو شەرح و ڕاڤەی دەستورەو وەرگرتنە لە دەقی قورئان و فەرمودەو سەنەدی ئیجماع پێی دەگوترێ (فیقە، مانا، واتە، قیاس، هۆکار، سەبەب، بیر، بەڵگە، ڕەئی، حجە، برهان) چونکە زانستی زانایانە، مەبەستی دەقی قورئان و فەرموودەیە، پەیوەندی لە جۆری قیاسەوە هەیە، بەڵگەی مەبەستی وەرگیراوە لە دەقەکان لە هەمان کات پێی دەڵێن ڕەئی، چونکە بۆچوون و تێڕوانین و وەرگرتنی زانایە لە دەق و، لەبەر ئەوە تەقلیدی دەکرێ چونکە ئەو دەقە بەپێی هەموو بنەماکانی زانستی

شەرعی ئەو ڕاوبۆچوونە گونجاوە لەگەڵ دەقی قورئان و فەرموودەی ڕاست و بەهێز.

لەکۆتایی ئەم باسەدا پێویستە ئاماژە بکەم کە زانایان زۆربە ئەدەب بوون بەرامبەر بە قورئان و فەرموودەو ئەگەر دەقێك هەبێت هەرگیز پێچەوانەی کار نەکراوەو پێشەوا شافعی دەفەرمووێ ئەگەر فەرمووده هەبێت کار بە ڕاوبۆچوونی من مەکەن، کەواتە فیقهی ئیسلامی بەهۆی ئەم زانایانە زۆر فراوان و بەهێز بووەو دەقێکی زیندووە بۆ هەموو کات و شوێن و هەرگیز زەمەن ناتوانێ کۆنی بکات تەنها داوایەك کە هەبێت ئەوەیە پێویست نییە دەمارگیری و تەعەسوب بۆ ڕایەکی تایبەت وا بکات کەلەبەر ڕاوبۆچوونی ئەو زانا یان ئەم زانا ئێمە تەئویلی کاڵ و کرچ دوور لە فام و ژیریەوە بکەین.

ناشبێ لەپێناوی پەیڕەوی زانایەك ڕق و کینە لە زانایانی دیکە دروست بکەین ﴿وَالَّذِينَ جَاءُوا مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ/ الحشر-١٠﴾ درود بۆ گیانی پاکی پێغەمبەر و یارو یاوەرانیو شوێن کەوتوان هەتا کۆتایی ژیان.







# چیرۆكا ((یوسف)) پێغەمبەری سلاڤ لێ بن

## پشكا ئێكێ


نا: عەبدولقاهر بژیانی


چیرۆك ژ ئایەتا(٤)ێ دەست پێدكەت، ول ئایەتا (١٠١)ێ ب دویماهی دهێت، ئانكو رویدانێت ڤێ چیرۆكا پڕی تراژیدی وبەلاڤكرینە ل سەر (٩٨) ئایەتا ژ (١١١) ئایەتا پێك دهێت، ئەم دشێین بێژین كو تنێ (٣) ئایەت یێن هیاتین وەك پێشگوتن، چیرۆك بەحسێ دەستهەلاتداری یێ دەست پێدكەت ﴿إذْ قَالَ يُوسُفُ لأَبِيهِ يَاأَبَتِ إِنِّي رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِي سَاجِدِينَ/ يوسف -٤﴾

ب بەحسێ وێ ب دوماهی دهێت ﴿رَبِّ قَدْ آتَيْتَنِي مِنَ الْمُلْكِ وَعَلَّمْتَنِي مِنْ تَأْوِيلِ الأَحَادِيثِ فَاطِرَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ أَنْتَ وَلِيِّ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ تَوَفَّنِي مُسْلِمًا وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ/ يوسف-١٠١﴾

بەلێ جوداهی یادناڤبەرا بەحسێ ل دەستپێكێ وێ ل دویماهیێ ئەوە كو ل دەستپێكێ دەستهەلاتداری (ملك) خەونە (كودبتەوەدی ل نك پێغەمبەرا)، ول دویماهیێ سوپاس (حمد) یا بجهـهاتناوێ خەونێیە كو دكەڤیتە دڤە شارامەعنا ﴿أَنْتَ وَلِيِّ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ تَوَفَّنِي مُسْلِمًا وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ/ يوسف-١٠١﴾ ژ بەركۆ مەرجێ (تسليم)ێ (حلاحە)ێ سوپاس یە (حمد)، ویا گرێدایە ب گەوهەرێ شیرەتا یەعقوبی ڤە ﴿وَيُتِمُّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكَ وَعَلَى آلِ يَعْقُوبَ كَمَا أَتَمَّهَا عَلَى أَبَوَيْكَ مِنْ قَبْلُ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْحَاقَ إِنَّ رَبَّكَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ/ يوسف-٦﴾

ئەڤ چیروكا پڕی تراژیدی ژ (٣) قوناغاپێكی دهێت، ئانكو ژیانا (یوسفی) سلاڤ لێ بن ژ (٣) قوناغاپێكی دهێت، وهەر قوناغەك ژ ژمارەكا رویدا نێت سەرەكی پێك دهێت، یێت كو دبنە دیمەنێت درامی یێت پڕی كارتێكرن ل سەر هەستی مرۆڤێ مسلمان، ژبەر كو لیێ ڤێ چیرۆكێ ڤە دگوهێزت ئەفراند نەرێ هەمی زانیایە.

قووناغا ئێكێ: ئەڤ قووناغە ژ خەونا (یوسف) سلاڤ لێ بن دەست پێ دكەت، وب داهێلاناوی دناڤ بیرێدا ب دویماهی دهێت، ئانكو ژ ئایەتا (٤) هەتا ئایەتا (١٨)ێ.

هەر ژ ئاراستەكرنا ئاخڤتنێ بۆ (محەممەد) پێغەمبەری سلاڤ ل سەربن ریوەرگێرانەكا ب لەز پەیدا دبیت و دیمەنێ یوسفیو بابێ وی دیار دبیت ﴿إذْ قَالَ يُوسُفُ لأَبِيهِ يَاأَبَتِ إِنِّي رَأَيْتُ




أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِي سَاجِدِينَ يوسف-٤﴾.

یوسف یێ دبێژیتە بابێ خوە: من دخەوا خوّدا دیت یازدە ستێرا و رۆژێ و هەیڤێ سوجدە بۆمن دبرن.

براستی خەونەکا عنتیکەیە. ستێرو رۆژو هەیڤ دێ چەواکەڤنە سوجدێ، ژ بەر کو کارێ سوجدێ بەژنەکا وەکی بەژنا مرۆڤی پێ دڤێت، یێ هەی بێژیت: هەمی تشت دخەونا دا چی دبن، بەلێ هەروەسا پێدڤییە بهێتە زانین کو خەونێت پێغەمبەرا وەحینە، ئەڤە وەحیە. ژبەر هندێ ژی (یەعقوب) پێغەمبەر سلاڤ لێ بن (یوسف) ژ ئەنجامێت بەلاڤکرنا وی دترسینت و دبێژیت: ﴿قَالَ يَابُنَيَّ لاَ تَقْصُصْ رُؤْيَاكَ عَلَى إِخْوَتِكَ فَيَكِيدُوا لَكَ كَيْدًا إن الشَّيْطَانَ لِلإِنسَانِ عَدُوٌّ مُبِينٌ يوسف-٥﴾،

ژڤێ بەرشڤێ دیار دبیت کو وێ خەونێ پەیوەندی یەکا موکم یا ب دوور هێلی ڤەهەی، ژ بەکو دبێژتێ: خەونا خوّ بوّ برایێت خوّ نەبێژە، دێ تشتەکی ب سەرێ تەئینن و شەیتان دوژمنەکێ ئاشکرایە بوّ مروڤا دێ رولێ خوّ بنیت. ژڤان هەردوو ئایەتا دیار دبیت کو ئاریشە ئاریشا دەستهەلا تداریێ (ملك)یە یوسف دبیتە مەزنێ بنەمالێ، هەمی دێ سەرێ خوّ بوّ چەمینن، ئەڤ چەندە ژی بە دلێ برایێت وێ نابیت، بەلێ هەلویستێ یەعقوبێ ئەوە کو برایێت یوسفی وێ چەندێ ژ خەونێ نەزانن، ژبەر کو تەفسیرا وێ یا دیارە: (١) ستێرا هەر یازدە برایێت یوسفی نەو رۆژ بابێ وییەو، هەیڤ دایە، یەعقوب بوّ خوّژی ڤێ چەندێ دبێژیت بەلێ وەك ئەویل ﴿وَكَذَلِكَ يَجْتَبِيكَ رَبُّكَ وَيُعَلِّمُكَ مِنْ تَأْوِيلِ الأَحَادِيثِ وَيُتِمُّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكَ وَعَلَى آلِ يَعْقُوبَ كَمَا أَتَمَّهَا عَلَى أَبَوَيْكَ مِنْ قَبْلُ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْحَاقَ إِنَّ رَبَّكَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ/ يوسف-٦﴾. دیارە کوّ دێ هێتە هلبژارتن وەك پێغەمبەرو شونیگرێ بابێ خوّ، ئانکو مەزنێ بنەمالێو، خودێ دێ ژ علمێ تەفسیرا خەونا نیشا دەت و نیعمەتا خوّ ل سەر تمام کەت هەروەکی ل سەر باب و باپیرێت وی تمام کری، بنیعمەت ژ نیعمەتا دین و ئیسلام و پێغەمبەرانی یێیە.

پشتی ڤێ چەندێ ئایەتا دمێت ﴿لَقَدْ كَانَ فِي يُوسُفَ وَإِخْوَتِهِ آيَاتٌ لِلسَّائِلِينَ/ یوسف-٧﴾، ئانکو هندەکی نیشان ل دەڤ یوسف بوّ برایێت دیار بوون: وەك بەرسڤێ بوون، بوّ ئەوان کەسێت پسیارا سەرو بەرێ وان یێ تێکچوی دکرن، بەلێ کەس ب سەر هل نەدبوو.

ئەڤەژی راستییەکا گرنگە بەلێ ل بەر خەلکەکی بەرزە ببوو، ژ بەر کو یوسف خەونا خوّ بوّ برایێت خوّ نەگوت بوو، وبراژی پێ حەسیابوون، ئەو ژی ب رێکا وێ سەرە دەری یا یەعقوبی د گەل یوسف دکر، دەمێ پوتیەکی زێدە پێ دکر، هەولددا بوّ پاشە رۆژێ ئامادەکەت ﴿إِذْ قَالُوا لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ أَحَبُّ إِلَى أَبِينَا مِنَّا وَنَحْنُ عُصْبَةٌ إِنَّ أَبَانَا لَفِي ضَلاَلٍ مُبِينٍ/ یوسف-٨﴾.





# کورتەیەك لە مێژووی دروستبوونی تەکیەی خەرپانی

## برهان شێخ محەممەد غەریب

لەنێو گوندە جوانەکانی هەوراماندا، خەرپانی دەبێتە لانکی خواپەرستی و مەڵبەندی بڵاوبوونەوەی خوێندەواری، سنوری ئەم گوندە بریتییە لەم شوێنانە: (بەلخە. دەرەقەیسەر، تاوێرە، دەرەشیشی سەروو. خارگێڵان کە لەبەرزاییەوە دەڕوانێتە ناوچەی شارەزوور).

تەکیەی خەرپانی لە سەردەمی (شێخ محەممەد کۆسە)وە دەست پێدەکات، ئەم زاتە بەرزە زانایەکی خواناس و شێخێکی پایە بەرز بووە، تەریقەتی (سوهرەوەردی) بە دەستەوە بووە دەتوانین بڵێین یەکەم تەکیەو مەدرەسە بووە لەکاتی خۆیدا لەم ناوچەیەدا، شێخ محەممەد کۆسە خۆشەویستییەکی زۆری خستبووە نێو کۆمەڵی شێخ و زاناکان و خەڵکییەوە، کە بەیەك دەنگ خەریکی خزمەت، دین و مرۆڤایەتی بن، بۆ نمونەش لەگەڵ مامۆستا سەید ئیبراهیم کە زانایەکی پایەبەرز دەبێت لەبنەماڵەی شێخەکانی سەرگەت. وەسیەت دەکەن هەر کامیان لەپێشدا وەفاتی کرد ئەویتریان کفن ودفنی بکات و خۆیشی بێت بۆ لای ئەو، ئیرادەی خوا وادەبێت لەپێشدا لەدنیا دەردەچێت و لەسەر وەسیەتەکەیان هەردوو لە مەقبەرەی گوڵ عەنبەر ئەسپەردە دەکرێن.

ئەم زاتە لە گوندەکەی خۆیاندا مزگەوتێ بنیاد دەنێ و نوێژی هەینی تیا دەکرێت و دراوسێکانی ئەم گوندە لەوێ جومعە دەکەن. هەر لە مزگەوتەکەدا شوێنێك دروست دەکات بۆ عیبادەتگای خۆی کە بە (کۆشکی شێخ) بەناوبانگ بووە، نەخۆشیان دەبردە ئەو شوێنەو خوای گەورە شیفای دەدا.

ئەم بنەماڵەیە کە (سید)ن دەچنەوە سەر (امام حمزة بن الامام الهمام موسى الكاظم) کە مەرقەدی لە قەرەداغە لە (تەکیە) بە (٣٠) پشت دەگەنەوە بە پێغەمبەری ئازیز (د.خ) وەك قورئان دەفەرموێت: ﴿وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ/ الحجرات-١٥﴾ لەم بنەماڵەیەدا چەندین پیاوی ئایینی تیا هەڵکەوتووە، وەك (شێخ ئەحمەدی گەورە) کە دەورێکی کاریگەری هەبووەو موفتی پاشای بابانەکان بووە، کەلەو وەختەدا تەریقەتی سوهرەوەردی بەدەستەوە بووە، واتە سەرەتای دروست بوونی ئەم تەکییەیە بەنزیککراوەیی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵەکانی (١٧٠٠) دەکاتە کاتی حوکمڕانی بابانەکان. هەروەها لەم بنەماڵەدا زانایەکی زۆر گەورەوپایە بەرز بەناوی (شێخ عەبدوڵڵای خەرپانی) لەزستاندا هاتۆتە هەڵەبجەو لە هاویندا هاتۆتەوە خەرپان و خۆی بە تەدریس و بڵاو کردنەوەی خوێندەوارییەوە خەریك دەکات. عیلم و عیرفانی ئەم زاتە بەم نووسینە مافی خۆی نادرێتێ. هێندە بەسە، کە بڵێین شێخ عەبدوڵڵا مامۆستای چەندین زاناو شاعیری ناوداری گەلەکەمان بووە، لەوانە: (مەولانا خالیدی نەقشبەندی و حەزرەتی نالی و مەولەوی و مەلا خدری رواری و... گەلێکی تر). بە فەرموودەی مامۆستا شێخ سادقی سەرگەت لەم تەکیەو مەدرەسەیەدا ئافرەت توانیویەتی بخوێنێت و




قورئــان بنووســێ و لــە ئاخــیری قورئانەکـــەدا نوسیویەتی:

### تەفسیرم بگوزاردی گەر غەلەتم بێ
### دەستم بەقەلەم پام پەراوالە بێ

بەبەردەوامی ئەم تەکیەو مەدرەسە لە خزمەت دابووە، زانای پایە بەرزو گەورە موفتی هەڵەبجەی شـــەهید، هەمیشـــە خـــەریکی ڕێکخســـــتنی مامۆستایانی ئایینیو قەزاوەتی شار بووە، لەگەڵ ئەوەشدا تەکیەکەی فەقیرو هەژاری ئەو شوێنە روویـان تێکـردوەو فـەقێو نابینـای زۆر لـەوێ خەریکی عیلم و زانیاریو قورئان لەبەر کردن بوون و، ئەم بنەماڵەیە چەندین مامۆستای پایەبەرزی تێدا هەڵکەوتووە وەك: مامۆستایانی پایەبەرز (شێخ جەمیلی موفتیو شێخ خالیدی موفتیو شێخ نورەددینی موفتی) سوپاس بۆ خوای گەورە پایەدارتری بکات، موفتی شارەکەمانەو بەردەوام قوتابی هەیەو چەندین مامۆستای ئایینی پێگەیاندوون و ئیجازەی پێداون بۆ خزمەتی گەلی کوردی موسڵمان، لە مزگەوتی (دار السلام) کە بە سەرپەرشتی خۆی دروست کراوە. یەکێکی دی کە لەو بنەماڵەیە کە هەر لەسەر تەکیەکەی باپیری بەردەوام بووە (جەنابی حاجی شێخ ئیسماعیلی خەرپانی)یە، هەر بە گەنجی لە تەمەنی (١٨) ساڵیدا خەلافەتی قادری وەرگرتووەو دەبێتە خەلیفەی حەزرەتی شێخ عەبدولقادر سۆڵە، کە دەورێکی زۆر گەورەی هەبووە لە ناو ریزەکانی گەلداو هەمیشە خەریکی ڕێکخستنی موسڵمانان بووە، شێخ ئیسماعیلی خەرپانی چەندین چلەی کێشاوە لەژێر فەرمانی مورشیدی خۆیداو، توانیویەتی مزگەوتەکەی باپیری دوو بەرامبەر گەورەو نوێ بکاتەوە لەگەڵ توالێت و چەندین دوکان و چاخانەیەك بۆ گوندەکە، هەر خۆی مزگەوت و تەکیەکەی بەڕێوە بردووەو هیچ موچەیەکی نەبووە، بەڵکو بەکشتوکاڵ کردن ژیانی خۆیان بەسەر بردووە.

خوشکی خۆی دەداتە بەڕێز (مەلا ئەحمەدی خەرپانی)، چونکە زانا بووەو خزمەتی بەدین کردووە، لە خزمەت (شێخ عەبدوللای خەرپانی)دا گۆڕی بۆ خۆی هەڵکەندبوو بۆ بەجێهێنانی کاری نێوان خۆیو خوای گەورە، هەرگیز جیاوازی لەنێوان خەڵکیدا نەکردووە تەنها بەچاکە نەبێت و، هەموو زاناو شێخەکانی خۆش ویستووە، دەی فەرموو هەموو کەس باوکی خۆی لەمامی خۆشتر دەوێت، دەبێت مرۆڤ بۆنیهەموو گوڵێك بکات و، هەموو گوڵەکان بەلای مرۆڤەوە یەکە، چونکە هەریەکەیان جوانیو بۆن و خەسڵەتی تایبەتی خۆیان هەیەو، مرۆڤ گوڵێکی لەگوڵەکانی تر بەلاوە جوانترە، ئەم زاتە هەردەم خەریکی خزمەت بە موسڵمانان بووە هەتا راگوێزراین ئەو شوێنەی پاراستووەو بەجێی نەهێشتووە. دوای راگوێزان لەساڵی ١٩٧٨ بۆ کۆمەڵگای عەنەب وەسیەتی فەرمووە کە حەز دەکات لەژێر ئاڵای (ابا عبیده) لە عەبابەیلی زیندووبێتەوە، هەر بۆیە ئەوێی هەڵبژارد بۆ دوا مەنزڵی لە دونیادا، ئەم زاتە لە ساڵی ١٨٩٩ز لە گوندی خەرپانی لە دایك بووە و لەساڵی ١٩٨١ز لە کۆمەڵگای عەنەب وەفاتی فەرموو، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَاذَا تَكْسِبُ غَدًا وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ**/ لقمان-٣٤﴾ ئەم زاتە پێش وەفاتی خۆی یەکێك لە کورەزاکانی لەشوێنی خۆی داناوە، کە ئەویش (حاجی شێخ بورهان شێخ محەممەد غەریب)ە.

سوپاس بۆ خوا ئەو تەکیەیە ئێستاش بە بەردەوام لە خزمەتی گەلی موسڵمان و کورددایە..

خوای گەورە بمانپارێزێت و لەژێر ئاڵای پێغەمبەردا (د.خ) حەشرمان بکات.

والسلام علی من اتبع الهدی.





# کارەساتی ئەنفال:
# شاڵاوی قڕکردنی کورد بوو

ن: هۆشەنگ

ئەنفال نامەیەکی کراوەیە لە کوردەوە بۆ جیهان، ئەنفال لوتکەی وێران کردنی کوردستان بوو بە ژێرخانی لادێو کشتوکاڵ و ژینگەو ئابووری کورد، ئەنفال هەنگاوێکی بێ بەزەییانە بۆ خنکاندنی کورد بەهەموو شێوەکانی لەناوبردن: چ لە رووی راگواستنی کورد بۆ کۆمەڵگەی زۆرەملێ، چ بۆ رەوانەکردنی بۆ تاقیگەو ئەزمونگەکانی چەکی کۆکوژیان بە گۆڕینی ناسنامەو پێناسەی کورد لەسەر خاکی کوردستان و تێکدانی قەوارەی نەتەوایەتی ئەم نەتەوە دێرینە، وا پێ دەچێ دروست بوونی عێراق وەك دەوڵەت تەنها بۆ ئەم ئامانجە بوویێت!! چونکە لە دروست بوونی ئەم کیانە هەوڵی سەرەکی لەناوبردنی کورد بووەو هیچ کارێکی نەکردووە نەبۆ عەرەب و نە بۆ ئیسلام و نەبۆ کورد و نەبۆ کیانە ئیستعمارییەکەو ئێمەی کوردیش بۆ ئەنفال و بەرچاوخستنی کارێکی ئەوتۆمان نەکردووە!! بەرژەوەندی ئابووری کارتێکی چەك فرۆشان و مەرگ فرۆشان و پەیوەندی توندو تۆڵی رژێم بەجیهانی عەرەب و دەرەوە ماوەی هەناسەی ئێمەی نەداوە کە رووی ترشی و تاڵ و کارەساتی ئەنفال بۆ دنیا روون بکەینەوە.

پرۆسەی قڕکردنی کورد کە رژێمی رەفتار فاشتی و گەندەڵی عێراق بەرنامەی بۆ داڕێژابوو لەژێر ناو گەلێکی زۆرو زەوەندەدا جێبەجێی دەکرد. ناوی وەحدەکانی سوپاو دەزگاکانی ئەنجام دەری ئەو پرۆسەیە کۆمەڵە ناوێکی مێژوویی و پیرۆزی لێ نابوو بۆ چاوبەستی و چەواشەکردنی خەڵکی سادەو ساکار. ئەو شوێنەی کەوێرانی دەکرد مرۆڤ گەلێکی نامۆو بیانی تێدا نیشتەجێ دەکردو، شێوازی سەربازگەو موڵکە، جەنگاوەرانی پڕ کینەو رق ئەستوری تێدا دادەنا، دەست بەجێ شوێنەکانی دەعەرەباند بە ناوی شوێنە داگیر کراوەکانی ئەندەلوس و فەلەستین بۆ شوێنی ونکردن و ئازاردانی هەستی مرۆیی و نەتەوەیی و ئایینی و ویژدانی کورد، لەبەر ئەوە ئەنفال لەهەموو روویەکەوە بۆ کورد کارەسات بوو، کاتی بێ دەنگی جیهان بوو، کاتی شەڕی ماڵوێرانکەری دژی ئێران بوو، کاتی یارمەتی و ستایشی رژێمەکانی عەرەب بوو بەتایبەتی سعودیەو کوێت، جیهانی زانست دەرگای زانستی چەکی کۆکوژو کۆمەڵ کوژی بۆ رژێم لەسەر پشت بوو بەناوی دژایەتی کۆماری ئیسلامی ئێران، پارەو چەك و مرۆڤی هەموودنیا یارمەتی رژێمی دەدا بۆ ئەم تاوانە کۆ کوژییە، کە تەنیا سڕینەوەی ناسنامەی کورد ئامانجی سەرەکی بوو، کە رژێم بەرنامەڕێژی بۆ کردبوو لەتەنگانەترین کاتی کوردستان





ئـەنجامی دەدا لـەژێر نـاوی بەدناوی (عەمەلیاتی ئەنفال) کە بێ پەردەو بێ ترس و بێ چەندو چۆنی و بێ بیانوو و بێ گوێدان بە بنەماکانی ئەخلاقی‌و ئایینی‌و نێـو نەتـەوەیی ترسـناکترین و بـەهێزترین و تـاوان بـارترین پرۆسەی قەلاچۆ کردنـی کـوردو لەبەر چاوی هەموو جیهان و بێ هیـچ پاسـاوێك و بڕوبیانویـەك ئـەم کارەسـاتە خوێناویـە دژی کـوردو کوردسـتان دەسـتی پێکردو بەسەرکەوتووی شـایی بۆ کرا!!.

چونکـە ئەگـەر نـاوەڕۆکی ئەنفالی ئیسلامی بریتی بێت لـە دەسـکەوتی جـەنگ، ئـەوا لـە ناوبردنی گەلی کوردی موسڵمان بەخاك و مرۆڤ و نـاو و زمـان و مێـژوو ئاسـەوارو نیشـانەو ناسـنامەوە، نـاوەڕۆکی ئـەنفالی رژێمـە لـە ١٩٨٨/٤/١٤ و چڵەپۆپـەی تـاوانێکی مـرۆڤ کوژی نـاوی ئەنفالـە لـە زمـانی کوردیـدا، ئەگـەر جـاران ناوچەیـەك، گوندێـك، چیایـەك، دەشـتێك ناوەکـەی دەگـۆڕاو عـەرەبی سـودانی‌و مـەغریبی و میسری‌و فەلەسـتینی‌و باشـوری عـێراقی عـەرەبی بـۆ دەهێـنرا، ئیدی ئەمجارە سیاسەتی زەوی‌و سـوتاو و مرۆڤـی بـرژاوو بـەکارهێنانی چـەکی کیمیـاوی نـاوی ئـەنفال بـوو لـەلای کـورد، ئەگەر جاران بەنەخشەو پلان و گۆڕینـی دەنـگ و رەنـگ و زمـان کوردیـان دەکوژانـدەوەو گـەمارۆیان دەدا پلـە بەپلـە بـۆ کۆمەڵگـەی زۆرە ملـێ رایـاندەگوێزا وەك هـەنگاوی یەکـەم و چـۆڵ کردنـی ناوچـە سـنوورییەکان و وێرانکردنـی گونـدو کوێرکردنـەوەی کـانی‌و سـوتاندنی رەزو بـاخ و کـەژو کۆسـارو توێکـڵ گرتنـەوەی دارگوێزەکـان و وشـك کردنـی دراسـتان و لەوەڕگـەکان بـە دەرمـان و ئـاگر بـەردان لـە دارستانەکان و،مین رێژکردنـی رێگـەو کێڵگـەو بانـەکانی کوردسـتان و قەدەغـەکردنی هێنـانی گژوگیـای خۆرسـکی ولأتەکەیان و گۆڕینی ناوی چیاو دۆڵ و شـێوەکانی کوردسـتان پـاش نـەمانی کـورد بـەناوی غەریب و نامۆ، ناوەڕۆکی ئەنفال بـوو، بـەلأم ئـەمجارە بـەڕژاندنی ژەهری کوشندەی هەناسەو چاو و گیـان و بـارانی زەردو سـوپای مەشـق دراوی درنـدەو بـێ بەزەیی‌و مرۆڤ کوژو دوژمن بە گیاو باڵندەو ئاژەڵ و گیاندارێش ئـەوە عەمـەلیاتی ئەنفالـە لای کورد!!

## بـێ هیـچ پاسـاوێك ئـەم کارەسـاتە خـوێناوییە دژی کـورد دەسـتی پێـکـرد

ئەو نـاوە ئـەوەندە بـەدناوە، ئابڕووبەرە، ئەوەندە بەد فەسـاڵ و بـەد چارەیـەو ژەهـراوی‌و ترسناکە کورد بەهاوتای قڕکردن و جنیوسایدو کۆکوژ ناوی دەبا، پێنج هـەزار گونـدو مـیرە دێـی ئـاوەدان و پـڕ دانیشـتوو بـە مزگـەوت و کـانی‌و بـاخ و مـاڵ و مەڕو ماڵأت و فێرگە، بە منداڵ و پیرو جەوان و ژن و پیاو و بگرە پەلـەوەری نـاو ماڵـەوە هـەرچی




نیشانەی ئاوەدانیو ژیان و ژیارهەبوو راماڵی کرد بۆ تاقیگەو دەرمانگەی کیمیاوی و زیاتر لە سەد و هەشتاو دووهەزار مرۆڤی دەست و دەم و پێ بەستراو راپێچی باشوورو نوگرەسەلمان و گرتوخانەکان کراو، کرانە خۆراکی سەگی پاسەوانی نوختەی پۆلیسیەکان و تاقی کردنەوەی چەکی کۆکوژو مرۆڤ کوژ ئەمەش بەدەستخۆشانەو ئافەرینی عەرەب و موسڵمان و جیهان و بەدەگمەن هەستیارێك هەبوو لە

**ئەگەر راپەڕین نەبووایە ئەنفالیش وەکو هەموو کارەساتەکانی دیکەی کوردستان دەچووە ژێر گڵەوە**

گوڵی کاڵتر بەم درِندانە بڵێیت، ئەگەر هیرۆشیماو ناکازاکی و هەلەبشیما نەبوایە لەپێش ئەنفال ئەوا ئەنفال گەورەترین ستەمی مرۆڤە لەسەر مرۆڤ، خۆ ئەگەر گرتنی کوێت لەلایەن رژێمەوە نەبوایە و گەردەلولی بیابان نەبوایە لە ئەنجامیش راپەڕین دروست نەبوایە، ئەوا ئەنفال وەك هەموو کارەساتەکانی دیکەی کوردستان دەچووە ژێر گڵەوەو لەناو دۆسییە نهێنییەکانی ئاسایشی نەتەوەیی عەرەبدا دەمایەوە، ئاسەواری کارەسات و قەبارەی زیانی ئەنفال لە رووی مرۆڤیو ئابووریو دەروونیو کۆمەلایەتی لەوانە کەمتر نییە، بەلام هێشتا وەك پێویست تیشك نەخراوەتە تاوانەکەو، زۆری لە دیمەنە دڵتەزێنەکانی بەپەنهانیو نهێنی ماوەتەوەو ئەنجامدەرانی لە دادگایەکی جیهانی و هەرێمدا هەموو ئەڵقەکانی و برگە شاراوەکانی ئاشکرا نەکراوە وەك فرۆشتنی ئافرەت بە عەرەب بەناوی کۆیلەو کەنیزەك و بلاوکردنەوەیان لەناوچەی کەنداودا، بەلام زەرەری کوشندەی ئەنفال چەندە قورس بێت و بەژان و ئێش و ئازار بێت دوو ئەوەندە بەکارهێنانی ئەم وشە قورئانییەو دانانی (الله اکبر) لەسەر ئەو ئالایەی، کە ئەم کارەی لەژێردا ئەنجام داوە و ناوی پیرۆزو ناوداری ئیسلامی لە خەلیفەو یارانی پێغەمبەر لەسەر ئەو سوپایە دانراوە، کە ئەم کارەساتەی ئەنجام داوەکە قورس ترە، چونکە ئەو رژێمە بچووکترین رێزی لە ئیسلام و قورئان و یاران دانابێ مەگەر بۆ مەبەستی عەرەباندن نەبێ لەوەش بەناسۆرتر بەجواب نەهاتنی دنیای مەدەنیو شارستانیو دادگایی نەکردنی ئەم تاوانبارانەی جەنگ و مرۆڤ کوژانەو لەوەش ناخۆشتر پشتگوێ خستنی ئەم کارەساتە جەرگبڕە لەلایەن کوردەوە، سالانە یادی ساردو سڕی دەکەینەوەو هەتا ئێستا کارەساتەکە لەچوارچێوەی (توێژینەوە و نرخاندن)دا لەبەردەم رای گشتیدا دانەنراوەو هەوڵنەدراوە پاشماوە بەناسۆرەکەی ئەنفال و ونبووەکانیو فرمانەکانی ئەنفالچییەکان و بەشدارانی کارەساتەکە ئاشکرا بکرێت، پێ دەچێ ئەو ئەورژمی (عێراق چییەتی) کە ئێستا بانگەشەی بۆ دەکرێ و دروشمی (پاراستنی یەك پارچەیی خاکی عێراق)





دوباره دەكەینەوە بەشێكە لە خوێن ساردی كورد بۆ بەكارهێنانی كارەساتی ئەنفال بۆ سوودی دۆزی رەوای كورد!

من دوو نمونەی زۆر رون و ئاشكرا دێنم وەكە كارەساتەكە كراوە بە دروشمی زۆر لێ كراوی و راكێشانی رای گشتی جیهان بۆ عەدالەتی كێشەكەیان یەكەم: لە مێژووی ئیسلامدا كارەساتی كەربەلاو شەهیدكردنی نەوەی پێغەمبەر(د.خ) و هەموو ساڵێك شیوەنیان تازە دەكرێتەوەو رای موسلمانی جیهانی بۆ رادەكێشرێ و لەبیر ناچێتەوە. دووەم: لەجیهانی رۆژئاوادا كارەساتی هەڵبەستراوی لەناوبردنی جولەكە لەلایەن نازییەكانەوە هەتا ئێستە زایونیزمی جیهانی ماوە نادەن لە بیر بچێتەوەو قەوارەی زایۆنیزم بۆ مانەوەیان سوودیان لێ وەرگرتووە.

بۆ وەلامدانەوە ئەم خەم ساردیە رۆژنامەی برایەتی لە ٢٠٠٢/٤/١٤ بەم شێوەیە پاساوی ئەم خوێن ساردیە دەداتەوە و لەراستیدا كەمێك پەردەی لەسەر ئەم تاریكییەی لابردوە (دەشێ بەشێكی ئەو بەدەنگ نەهاتنەوە بۆ بێ

## ئامانجی سەرەكی ئەنفال سڕینەوەی ناسنامەی كورد بوو

پشتوپەنای كورد و هۆكاری دیكەی مەوزوعی بگەڕێتەوە، بەلام نكوڵی لەوە ناكرێت كە بەشێكی گرنگیش دەرەنجامی خەم ساردیو لێنەزانین و كەمتەرخەمی خۆمانە، ئێمە ئێستا هەر خۆبەخۆ لە سرودێكی عاتیفیو ویژدانی سالانە ئەم یادە دەكەینەوە دەیكەینە بۆنەیەك بۆ دڵدانەوەی لێ بەجێماوانی كارەساتەكە، هەوڵێكی جیدیمان نەداوە دەرەوەی بازنەی خۆمان ئەم كارەساتە بورۆژێنین و تا ئێستاش هەر بۆ خۆمان دەدوێین، تا ئێستا لە چەند هەوڵێكی سەرەتایی بترازێ هەڵمەتێكی جیدیو زانستیمان بۆ كێو ماڵ و ئاماركردنی قوربانییە بێ سەرو شوێنەكانی ئەنفال نەكردووە..

دیارە ژمارەی قوربانییەكان (١٨٢) هەزار كە تائێستا ژمارەیەكی سیاسییە بەبەلگەو ئامارو لیستی ناو پشت راست بكەین و لەژمارەیەكی سیاسییەوە بیكەین بە ژمارەیەكی زانستی بەلگەدار، هەڵبەتە ئەو ئەركە گرنگ و ستراتیژییە لەسەر شانی هەموو میللەتی كوردە بە حكومەت و حزبەكان و دامەزراوەكانی كۆمەڵگەی مەدەنیو توێژەر و شارەزایانەوەو هەر دەبێ بەو ئاراستە زانستیو مەدروسەدا هەنگاوی بۆ بنرێت، بەتایبەتی كە ئەمڕۆ رەوشی كوردستان لەبارترە، بۆیە جێی خۆش بەختییە لە رێكەوتی (٢٠٠٢/٤/١٤) لە هەولێری پایتەخت یەكەمین كۆنفرانسی زانستی ئەكادیمی بەبەشداری چەندین پسپۆرو شارەزاو مامۆستای زانكۆی عەرەب و كورد لە ئەورووپاو لە ولاتانی عەرەبی لە ناوەوەی هەرێمی كوردستان لە بارەی ئەنفالەوە دەبەسترێت. بەبۆچوونی ئێمەش زۆر گرنگە زامی ئەنفال و كیمیاباران و داگیركردنی خاكی كوردستان و عەرەباندن و كەمكردنەوەی قەبارەی كورد لە عێراق لەژێر هەرناوێك بێت هەمیشە لەبەر چاوبێت و كاری لەسەر بكرێت شەرمەزاری بۆ ئەنفال چییەكان و سەبوریش بۆ كەس و كاریان.





# هۆنراوە سیاسییەکان زامەکانی هەڵەبجەیان سارێژ نەکرد، تۆ بڵێی گێڕانەوەی کارەساتەکە هەوێنی ئازارەکانی خەڵکی ئەو شارە بێت؟!

دیمانەو ڕاپۆرت: سامان بەشارەتی

چواردە ساڵ لەمەوبەر لە ڕۆژی ١٦/٣/١٩٨٨دا کۆمەڵە فڕۆکەیەکی دژ بە مرۆڤایەتی هێرشیان کردە سەر خەڵکی مەدەنی‌و بێ دەرەتانی شاری هەڵەبجە، هەرچی لەجبەخانە کیمیاییەکەی ڕژێمی عێراقدا بوو بەسەر خەڵکی ئەو شارەدا ڕژاندیان، هەڵەبجەیان کردە تاقیگەیەکی گەورە بۆ هەموو چەکە کۆکوژەکان. زۆر زاراوەی سیاسی‌و ئەدەبی بەکارهێنراوەو زۆریشن ئەوانەی هەڵەبجەیان لاواندۆتەوەو دەیلاوێننەوە، بۆیە ئەم جارەیان پەنا دەبەینە بەر ئەو کەسانەی یان ئەو قوربانیانەی کەلەناو ئەو کارەساتە جەرگ بڕەدا بوون، تا هەریەکەیان لایەنێك لە مەینەتەکانی خۆی لەو ڕۆژەدا بگێڕێتەوە.

**جوان عەزیز** ئافرەتێکە هێشتا ئاساری کیمیا بارانەکەی پێوە ماوە، وتی:

شەو لەماڵ دانیشتبووین ئاگامان لە هیچ نەبوو، کە ڕۆژ بووەوە یەکسەر بۆردومان دەستی پێکرد، کاتژمێر ١١ی بەیانی وردە وردە بۆردومان بەردەوام بوو کیمیاوی بوو، ناپاڵم بوو، بەڵام بۆردومان (جوان خان لەپڕێك ئاخی هەڵکێشاو وتی ناتوانم قسە بکەم. دەگریا دەیوت: من هەموو جارێك لە یادی هەڵەبجەدا قسە دەکەم هیچیان بۆ نەکردووم هەر ئازارم دەدەن، بەڵام من دڵخۆشیم دایەوە، وتم بەردەوام بە لە قسە کردن) وتی: ئێوارە فڕۆکەکان هاتنەوە وەك جاران دەنگی نەبوو ئەم جارەیان سەیر بوو دەنگی کپ بوو وتمان لەوانەیە ڕزگارمان بووبێت ئەوەندەی پێ نەچوو ئێمە لەژێر زەمینی ماڵەوە بووین و دونیا بەرەو تاریکی دەچوو، بەڵام ڕووناکی ئاسۆیەك لە پەنجەرەکانەوە






دەهاتە ژوورەوە لەو ڕۆشناییەوە بینیمان دووكەڵێك دەهاتە ژوورەوە هەروەك دووكەڵی جگەرە، بەڵام ئەم كاڵتر بوو، ئێمە دوو پیاومان لەگەڵدا بوو دەیانزانی لەبەر ئەوەی ئەوان سەربازییان كردبوو هەستان هاواریان كرد لە ژێر زەمینەكە. كە پڕبوو لە خەڵك و پێشمەرگەشی تیابوو هاواریان كرد و وتیان ئەوە كیمیاییە هەموو دەم و لووتان بگرن هەستان ئەوەی پارچە پەڕۆیەكی پێ بوو تەریان كردو دایان بە دەم و لووتیان، منیش برایەكم هەبوو كتێب و دەفتەری هەبوو هەڵی دایە خوارەوەو ئاگری تێبەردا لەبەر ئەوەی دووكەڵ بكا دووكەڵی كیمیاوییەكە نەهێڵێ. بەڵام ئەوەش هیچ سوودی نەبوو هەڵسا ئاوی هێنا كردی بەسەر خەڵكەكەدا، بەڵام ئەوەش سوودی نەبوو چاوەكانمان بەرەو كزی دەچوو لە ئێمە وایە شەوە، براكەم وتی ئەوە هیچ سوودێكی نییە هەستن بڕۆن بۆ سەر شاخەكان. هەمووما رامان كردە دەرەوە بۆ سەر شاخەكان بچین. شاخەكانیش دوور بوون لێمان، كە چووینە دەرەوە تەماشا دەكەین منداڵ و پیاوو ژن هەموو لەو ناوەدا كەوتوون هەتا حەیوان و تەیرەكانیش بە ئاسمانەوە كەوتبوونە خوارەوە. ئێمەش تووشی ڕشانەوە بووین چاومان هیچی نەدەبینی بەس براكەم نەبێت ئەو هەستا هەموومانی بەیەكەوە بەستەوە، كاریگەری ئەو كیمیاویە وای لێكردین پێستی دەم و چاو و دەستمان هەموو هەڵی دەدا هیچ بە تەمای خۆمان نەبووین. هەتا وەكو دوو مانگ سێ مانگ لە نەخۆشخانەی تارانی ئێران ماینەوە سێ مانگی ڕێك چارەسەریان دەكرین، ئەوجا چاك بووینەوە، بەڵام من ئێستاش لەشەودا چاوم نابینێ تووشی شەو كوێری بووم، من لە كۆتاییدا دەڵێم هەر هەڵەبجەی شەهید بوو كوردی بە هەموو جیهان ناساند.

**هاووڵاتی عەمار نەجمەددین** وتی: كاتێك لە ١٩٨٨/٣/١٦ كە كیمیا بارانی هەڵەبجە كرا ئەو كات ئێمە لە ماڵەوە بووین. خەڵك ئاگای لەهیچ نەبوو ئەو كارەساتە لەلای ماڵی ئێمەوە دەستی پێكرد، ماڵی ئێمەش لەناو شارەوە بوو لاشەی مردوویان دەهێنایەوە، خەڵك شێت بوو نیوەی كوێر بوو، تەنانەت ئەوەشم لەبیرە لە دەرگا هاتمە دەرەوە باوكێكم بینی كوڕەكەی لە ناو عەرەبانەیەكی یەك تایی نابوو مردبوو. ئێمە ماینەوە لەژێر زەمین ئاگاداریان كردینەوە كە بەتانی تەڕكەین بیدەین بەسەرماندا، بەڵام بێ سوود بوو كاریگەری كردە سەر چاومان و ئەعسابمان و دوای ئەویش لەخێزانەكەمان خەڵك مرد، باپیرو نەنكم مردن كە خۆم بەدەست نەنكمەوە بووم كاتێك مرد دواتر ئێمە لەژێر زەمین دەرچووین، ڕۆژێك پێش ئێمە كیمیاوییەكە ڕژابوو خەڵك هەمووی كەوتبوو بەهەزاران مردبوون و بەهەزاران چاویان نەیدەبینی. ئێمە لە عەبابەیلێ بەرەو شنروێ دەرچووین، ئەو خەڵكانەی بەرەو ڕێی عەنەبەوە دەرچوون زۆربەیان مردن، چونكە لەو ڕێگەیەوە كیمیاوی ڕژاندبوو لەبەر ئەوەی خەڵكێكی زۆر لەو ڕێیەوە دەڕۆیشتن لە ڕێگەی خۆمان خەڵكمان دەبینی پەتیان بەخۆیانەوە بەستبوو، لەبەر ئەوەی لەیەك ون نەبن كەس ئاگای لەكەس نەمابوو لەتاوگیانی خۆیان. كۆمەڵێكی ترم بینی بە ڕیزە هەشت نەفەر پەتیان بەخۆیانەوە بەستبوو بەس ئەوەی پێشیان چاوی دەبینی ئەوانی تر كوێر ببوون. ئەو خەڵكانە هەموویان






تامەزرۆی یەك قوم ئاو بوون هەر بۆ نموونە من خاڵم چووە ژێر پردێك بۆ ئاو خواردنەوە بە کۆمەڵ خەڵکی لێ بوو سەلامی لێ کردن کەس جوابی نەداوە ئەوانە لەو ئاوەیان خواردبۆوە هەموویان مردبوون.

دوای ئەوەی ئێمە دەرچووین چووینە ئۆردووگاش ژیانمان لەوە باشتر نەبوو، کە لەهەڵەبجە بووین چ لە رووی ئابووری چ لە رووی تەندروستییەوە بەهەر حاڵ ئەو کاتەی کە لە ئۆردووگا گەڕاینەوە بۆ عێراق حکومەتی عێراق ئەنفالی کردین.

ئێمەیان هێنایە نەخۆشخانەی فریاکەوتنی سلێمانی دوایی پێیان گوتین دەتانبەین بۆ هەڵەبجە لەوێ کەل و پەلەکانیان بەجیا بارکردین پیاو بە جیا ئافرەت بە جیا هەریەکەمان بۆ شوێنێکیا برایـن تۆپـزاوە لەکەرکوك لەوێ ماوەیەك ماینەوە دوای ئەوە بردیانینە نوگرە سەلمان بەراستی باس کردنی نوگرە سەلمان بەهیچ کۆتایی نایەت، لەوێش دووبارە برینمان کولایەوە کە هیچ بنکەی تەندروستی لێ نەبوو، ئەو خەڵکە چارەسەر بکەن بەهەزاران خەڵك تووشی مەلاریاو کولێرەو کوێری بوون کە خەڵکەکە دەمردن دەیان دان بەدەم سەگەوە پاش ئەو هەموو ئەزیەتەی لە بەندینخانەی نۆگرە سەلمان بردمانە سەر خوا دەزانێت چۆن بوو، من یەکێك لە بیرەوەرییەکانم سێ برادەرم هەبوو یەك خوشکیان هەبوو دایك و باوکیان لە کیمیاوییەکە لەناو چوو ئەو سێ برایە بەیەك رۆژ مردن تەنیا یەك خوشکەکەیان مایەوە، من بەدیاریانەوە دانیشتبووم چاویان سپی هەڵگەراو مردن بەراستی ئەویش کارەساتێکی تر بوو بەسەر خەڵکی هەڵەبجەدا هات، دوای ئەوە حکومەتی عێراق لێبووردنی گشتی دەرکردو ئێمەیان هێناوە ئۆردووگای گردە چاڵ و بەرحوشتر دایان نایین خەڵکی شاری هەولێر یارمەتییەکی زۆر باشیان داین قەد لە بیرمان ناچێت، چونکە ئەو کات حکومەتی عێراق ئێمەی لەسەر درك دانا ئەو ماڵانەی هەولێر هەریەك ماڵێکی بردە لای خۆی تا شوێن و جێمان بۆ دابین کرا. خاڵێك گرنگە بەلامەوە لە کۆتایدا باسی بکەم ئەویش ئەوەیە ئێمە ئەو کاتی قوتابی بووین هیچ قوتابخانەیەك ئێمەی وەرنەدەگرت، وتیان لەبەر ئەوەی خەڵکی هەڵەبجەن کە دەرۆیشتینە هەر قوتابخانەیەك بیانزانیایە خەڵکی هەڵەبجەین وەریان نەدەگرتین، ئێمە ئەو کات ئاوابووین، بەڵام هەموو کات خەڵکی هەڵەبجە شانازی بەوە دەکەین ئەوە ئازادییەی ئەمڕۆش بەر قەرارە لە کوردستان لە سایەی بارزانی نەمرو کاکە ئیدریسی هەمیشە زیندوو تەواوی شەهیدانی کوردستان.





# هۆشیاری لە هەندەران

قاسم بەرزنجی

لەدوای راپەرینە مەزنەکەی بەهاری ساڵی ١٩٩١ و کۆڕەوە ملیۆنییەکەی خەڵکی کوردستان بارودۆخێکی نالەبار بەتایبەت لەبواری ئابووری هاتە کایەوەو خەلکان زۆر بەزەحمەت دەیانتوانی بژێوی ژیانی رۆژانەی خۆیان و منداڵیان پەیدا بکەن، رۆژ بەرۆژ بێ ئومێدی زیاتر دەبوو، رێگا چارەیەك بەدی نەدەکرا بەنیازی چارەسەری کێشە سەرەکییەکان. تا ئەنجامدانی هەڵبژاردنە سەرتاسەرییەکەتی (مایس)ی ساڵی (١٩٩٢)ی کوردستان و دامەزراندنی پەرلەمان و حکومەتی هەرێم و دووبارە پێك هێنانەوەو بەگەڕخستنەوەی دام و دەزگا ئیدارییەکان، کە یەکەم هەنگاوی هەرە پیرۆز بوون بۆ گۆڕینی ئەم بارە ناهەموارەو نەهێشتنی مەینەتیو گەڕانەوەی هیواو متمانە بەخۆبوون، ئەوە بوو بۆ ماوەیەك توانرا تا رادەیەك بەرژەوەندییەکانی تاکە کەسی بەلا بنریۆ هەنگاوی جیدی هاوێشترا بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی بژێوی هاووڵاتییان و جێگیرکردنی ئەمن و ئاسایش لەوڵات، کە بووە هۆی کەم کردنەوەی ئاسەواری زوڵم و زۆرداری سەردەمی رابووردوی گەلەکەمان و هاووڵاتیان بەگشت چین و توێژەکانییەوە خەریکی کارو پیشەی رۆژانەیان بوون، بەڵام بەداخەوە بۆ بەردەوام نەبوونی ئەم واقیعە و هەڵگیرسانی شەڕی نەگریسی ناوخۆ کە تاکە ئاواتی بەرزی دوژمنان و ناحەزانی گەلەکەمان بوو و بووە هۆی تێکدانی ئاسایش و گەڕانەوەی باری نائارامی لەکوردستان، کە لەئەنجامدا هەندێ لەهاووڵاتیان بەتایبەتیش گەنجەکان دەستیان بەهەوڵدان کرد بۆ بەجێ هێشتنی زێدی باب و باپیرانیان و کۆچ کردنیان بەرەو هەندەران بەجۆرەها شێوازی ترسناك کە زۆر جار مەرگ دەبووە خەڵاتی هەوڵ و ماندووبوونیان، بەڵام سەرەڕای ئەوەی ئەو نائارامییە زوو بڕایەوە سالانێکە لەسایەی حکومەتی هەرێمی کوردستان ئاسایش بەرقەرارەو باری ئابووری سات بە سات لەگەشەدایە، کەچی هاووڵاتیان تا ئەمڕۆ ئەوەی توانیبیتیو بواری بۆ رەخسا بێ سەری هەڵگرتووەو خۆی لەوڵاتێکی بیانی گرتۆتەوە چونکە تەمەننای بووە کوردستان بەجێ بهێلی جا بەهەر بیانوویێك بێت.

تائێرە باسەکە رووداوێکی بەردەوامە نە کۆتایی پێ هاتووەو نەبەربەستیش لەپێش سەفەرکردن بۆ هەندەران هەیە چونکە ئەگەر هەشبێ ئەوا هاووڵاتیان لەرێگای قاچاغچییە خوێن مژەکان و بەشێوازی نایاساییو دانانی ژیانی خۆیان کارەکە ئەنجام دەدەن. بەڵام ئەوەی من دەمەوێ بیلێم داکۆکی کردنە لەم ئەرکە پیرۆزەی کە





لەسەرشانی ئەم هاوولاَتیانەیە کە ئێستا ژیان لەهەندەران بەسەر دەبەن و نابێ فەرامۆشی بکەن، ئەگەر بەهەرحاڵێك و دەردەسەرییەکیش کوردستانی بەجێهێشتبێ، ئەویش ئەوەیە کە دەبێ هەولی بێوچانی ئەوە بێ خۆیو رابووردەکەی لەیاد نەکات و نەهێڵێ کەلێن بکەوێتە هزرو رەسەنایەتی نەتەوەکەی. بۆ ئەم مەبەستەش ئەبێ پابەندبێ بەم سێ خاڵەی خوارەوەو هەرگیز هۆکاری وای لا دروست نەبێ، کە رێگر بن لەبەردەم جێبەجێ نەکردنیان. چونکە خوانەخواستە ئەگەر پێچەوانە رووبدات گەورەترین کارەسات دەخولقێو پەشیمانیش لەدواڕۆژ دادی نادات، خاڵەکانیش ئەمانەن:

١-هاولاَتی کورد لەهەندەران بەر لەگشت شتێك دەبێ بەردەوام پابەندبێ بە ئایینە پیرۆزەکەیو لێی دوور نەکەوێتەوەو نەهێڵێ ئەو دڵەی کە بەئیمان و تەقوا روونە گەردی تاریکی لێ بنیشێو لەفەرمانەکانی خوای گەورەو پێغەمبەر (د.خ) دووری بخاتەوە. چونکە پابەند بوون و عەقیدەی پاکی ئیسلام بڕبڕەی بوونی ئادەمیزادە لەدنیاو ئاخیرەتتداو هۆکاری سەرەکی خۆشیو سەربەرزی ژیانە و نابێ بەهیچ شێوەیەك و بەهیچ بیانوویێك لەهەر شوێنێك بێت فەراموش بکرێت یان دوو دڵی و گومانی تیا بکەوێت.

٢-دەبێت رۆڵەی کورد هەموو دەم کوردییەتی خۆی بسەلمێنێت و کوردستانەکەشی بەولاَتی سەرەکی خۆی بزانێ ئەگەرچی لێشی دوورە، لەوەش زیاتر دەبێ پەروەردەکردنی منداڵەکانیشی لەسەر رێبازە کوردییەکە بێت و نەهێڵێت باری غەریبیو دوور لەکێو و تەلاری کوردستان و دوور لەئەلف و بێی قوتابخانە سەرەتاییەکانی لای خۆمان ئەو کارە سەلبیە بخاتە سەر منداڵەکانی کە زمانە زگماکەکەی باب و باپیرانی بە نامۆ بزانێو حەزو ئارەزووی بۆ نەچێت، چونکە دەبێ بزانێ ئەگەرچی ئەم حاڵەتە کارەساتە لەهەمان کاتدا تاوانیشە و لێبوردنی نابێت و بەرپرس دەبێت بەرامبەر گەل و نیشتمان و ویژدانەکیو ئۆباڵی ئەم کۆرپانەش دەبێتە تەوق و یەخەی بەر نادات.

٣-شاراوە نییە کە ئێمەی کورد وا هەڵکەوتووین خاوەن داب و نەریتی کۆمەلاَیەتی خۆمانین و پشتاوپشت لە باب و باپیرانمانەوە وەك میرات بۆمان بەجێماوە لەسەریشمان فەرزە پارێزگاری لێ بکەین و پێوەیان پابەند بین، چونکە واز لێهێنانیان و دوور کەوتنەوە لێیان دەبێتە هۆی ناشازیو نامۆیی بۆ ئەم کەسە، هەڵبەتە هاوولاَتی کوردیش لەهەندەران تێکەلاَوی بە داب و نەریتێکی کۆمەلاَیەتی وا دەبێ کە سەد دەر سەد جیاوازی هەیە لەگەڵ داب و نەریتی کوردەواریمان و پێویستە کار نەکاتە سەر خودی کەسە و خۆڕاگربێت لەبەردەم هەموو گۆڕانکارییەکان.

لەکۆتاییدا دەڵێم ئافەرین بۆ ئەو هاوولاَتییە کوردە دڵسۆزەی کە ئەم خالاَنەی سەرەوەی لاپەسەندەو هەردەم لەخەیاڵی جوانی دۆڵ و چیاو رەزو باغی ئەم کوردستانەیەو تا مردن گۆڕانی بەسەر نایەت و ناهێڵێت بەر تیرەو تانەی شاعیری گەورەی گەلەکەمان (حاجی قادری کۆیی) بکەوێت کە دەرهەق بەو زۆڵە کوردانەی گوتووە، کە زمانی شیرینی زگماکی خۆیان لەبیر دەکەن و یان حەزی لێ ناکەن.




# شارستانییەت و رەوشت

یاسین مەلا عەبدوڵڵا چومبارۆکی

جیهان لەماوەی سێ سەدەی رابردوودا بەتایبەتی لەنیوەی دووەمی سەدەی بیستدا پێشڤەچوونێکی شارستانی گەورەی بەخۆوە دیووە، کە هەموو لایەنێکی ژیانی گرتۆتەوەو، بەهۆیەوە توانی بەرەو قووڵایی دەریا بڕوات و. پێی خۆی لەسەر نێوچاوانی ئەستێرەکان دابنێت و، بەپێی ئەم پێشڤەچوونە کۆمەڵگاکان گۆڕانکاری بەسەردا هات و شێوەی ژیانیش گۆڕا. بەشێکیان بەهۆی ئەو یاسایانەی کە دانران بۆ ئەوەی بگونجێت لەگەڵ ئەو پێشڤەچوونە شارستانییە نوێیەو، بەشێکیان بەهۆی کاریگەری (داهێنان و دۆزینەوە) کە سەری هەڵدا، کەوا وای لە مرۆڤ کرد لەگەڵیان بگونجێت. هەتا وای لێ هات گۆڕانکاری لە ماڵ و خواردن و جل و بەرگ و پەروەردەکردنی منداڵ بەرپا بکات.



هەتا بەرامبەر بە کۆمەڵگاکانی دووریش، کە ئەمانەش وای لە ژیانی مرۆڤی ئێستای کرد کە گۆڕانکاری هەبێت لەگەڵ ژیان بەسەر بردنی پێشینەکان.

گومانی تێدا نییە کە مرۆڤایەتی سوودێکی زۆری لەو هەنگاوە ئیجابیانەی کە هاتنە دی لە گۆرەپانی شارستانیەتدا بینی، کەتوانی زۆربەی کۆسپەکان ببڕێت و ژیان ئاسانتر بکات.

مرۆڤ دەتوانێ ئەم راستییە بەرجەستە بکات، بەهۆی بەراورد کردنی سواری وڵاخ لەهاتووچۆو سواری تەیارە...هتد. ئەمانە توانایی عەقڵی مرۆڤ و دەستکەوتەکانیەتی، بەهۆی ئەو رێزو ژیرییەی خودای گەورە پێی بەخشیووەو، کە هەموو گیان لەبەرێکی کردۆتە ژێر دەستی هەروەکو خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلاً/ الاسراء-٧٠﴾.

شارستانیەتی ئێستا (هەر چەندە لەو پەڕی پێشکەوتندایەو تاوای لێ هاتووە گومان ببردرێت کە بێ رەگە) تەواوکەری شارستانی کۆنە، کە لە جۆگەلەکانی ئەو ئاوی خواردۆتەوەو ئێستاش پێگەیی و بەری داو پەلکەکانی پشکوتن و سێبەری گەورە بوو. ئەوەی ئێستا هەتا ئەمڕۆش سوود لە زانیاریو پێشکەوتنی کۆن





دەبینن و جوانتری دەکەن.کەس ناتوانی نکۆڵی لە پێشڤەچوونی میللەتی کۆن بکات، کە گەیشتبوونە ئەو پەڕی لوتکەو. هەر زانیاری ئەوان بوو کە بوود بەردی بناغەی شارستانیەتی ئێستا.

مرۆڤ کە پەرتوکەکانی مێژوو هەڵدەداتەوە، سەری لە ژیانی هەندێك لەو میللەتانە سور دەمێنێ، یان کە سەر لەمۆزەخانە(متحف) دەدەیت بەرامبەر شتە کۆنەکان کە لەو پەڕی.وردیو سەیری دان کە ئێستاش دروست ناکرێن پڕ بە دەم هاوار دەکەی (مرۆڤی ئێستا قوتابی مرۆڤی کۆنە). بەڵام شارستانیش وەکو هەموو بوونەوەرێك تووشی بێ هێزی دەبێت پاش بەهێزی پاش گەنجیش دووچاری پیری دەبێت.

شارستانیەتی ئیسلامی. یەکێکە لەو شارستانییە کۆنانەی کە شارستانیەتی سەردەم سوودی لێ وەرگرتووەو تەواوی کردووە، چونکە شارستانی ئیسلام چەند سەدەیەك لە مەیدان بوو، بەهۆی ئەوەوە زانستە کۆنەکان و لێکۆڵینەوەکانیان پارێزران پێش ئەوەی بۆ رۆژئاوا بگوازرێتەوە.

چاکەو فەزڵی بەرزیو توندی ژێرخانەی شارستانیەتی ئیسلام بۆ ئایینی پیرۆزی ئیسلام دەگەڕێتەوە کە عەقلی مرۆڤی رزگار کرد لە سستیو راوەستان و، فەرمانی بە شوێن کەوتوانی کرد بە زانین و زانیاریو گەڕان لە جیهان و لە ئەرزو ئاسمان وردبوونەوە، پلەی زانای بەرزتر کرد لە خوا پەرستی.

هەر بە هۆی ئیسلام و زانیارییە پێشکەوتووەکانی بوو کە موسڵمانان توانیان نەك هەر دەست بگرن بەسەر فراوانترین ناوچە، بەڵکو توانیشیان کە چەند کۆمەڵگایەکی پێشکەوتوو کە دادپەروەری باڵی بەسەر کێشابێت دروست بکەن، لەسایەی ئیسلام لەو کۆمەڵگایانە بزوتنەوەی زانستی سەری هەڵداو، زانایان روویان لە خوێندنی هەموو زانستەکان کرد، سەرباری زانستی ئایینیو زمانەوانی، دەرگایەك نەما لە دەرگاکانی زانست کە لێی نەدەن و، شوێنەوارەکانیان لە (هەندەسەو گەردوونناسی و طب و صیدلە و شوێنەوار ناس و مۆسیقاو فەلسەفەو مەنتیق.. هتد) هەموویان شایەدیان بۆ دەدەن و، ئەو هەموو پاشماوە لە

**شارستانیەتی ئێستا تەواوکەری شارستانی کۆنە لەجۆگەلەکانی ئەو ئاوی خواردۆتەوە**

ئەو مزگەوتە رەنگین و کۆشك و قوتابخانەو سەیرانگایانە شایەدی بلیمەتی ئەوان دەدەن لەسەر دەمێك، کە تاریکی باڵی بەسەر هەموو لایەکدا کێشابوو. ئایا کەس دەتوانی نکۆڵی لەو شارستانییە بکات؟ کە لە بەغداو دیمەشق و بخاراو ئەسفەهان و قورتوبەو قاهیرەو قەیرەوان سەری هەڵدابوو. یان کەس دەتوانێ نکۆڵی لەو دۆزینەوە زانستیانە بکات کە لەسەردەستی زانا موسڵمانەکان بەدی هات، وەکو: (ابن السینا وابن البیرونی وفارابی وابن الهیثم وابن النفیس) لە




# شارستانیەتی ئیسلام بۆ خۆش گوزەرانی خەڵك هەوڵدەدات

ڕۆژهەلات و (ابن الجزار وابن البنا وابن طفیل وابن الرشد) لە ڕۆژئاوا. نەخێر ناتوانن.

سەرباری پێشڤەچوونی شارستانییەتی ئیسلام لە ڕووی ماددییەوە، چەند لایەنێکی تریش سەری هەڵدا لە ڕووی ڕەوشت و چاکە کە خوداو پێغەمبەری خوا (د.خ) ئەمریان پێ کردووە. وەکو ڕێزنان لە کەرامەتی مرۆڤ و حوکم کردن بە دادپەروەریو شوین کردن و ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپەو دانەوەی ئەمانەت و سڵاو کردن و.. سەدانی دیکەو، بەڵکو هەزارانی تر.

## ئامانجی شارستانیەتی ئیسلام

شارستانیەتی ئیسلام بۆ خۆش گوزەرانی خەڵك هەوڵدەدات و دابین کردنی خۆشی جەستەیی بە بلاوکردنەوەی زانست و پێشخستنی پیشەسازیو بازرگانیو...هتد. هەروەها هەوڵدەدات بۆ دابین کردنی هیمنایەتی دەروونی بۆیان و پاراستنی کەرامەت و زامن کردنی مافەکانیان و دوور گرتنیان لەهەموو زەرەرو زیانێك کە بەرۆکیان دەگرێت. نمونەی ئەمانە زۆرە کە بیریان لە هەموو شتێك کردۆتەوەو تەنها مەبەستیان ڕەزامەندی خودای گەورە بووە. بۆ نمونە لە مەغریب هەندێك زەوی وەقف کرابوو پارەی بۆ فەقیرو هەتیوان لەکاتی ژن هێنانیان سەرف دەکراو، وەقفێکی تر بۆ هەڵبەستنەوەی باڵ و لاقی باڵندەکان لەکاتی شکان سەرف دەکرا.. هتد. بەڵام ئەمڕۆ موسڵمانان خۆیان لەبەردەم شارستانیەتێکی نوێ دەدۆزنەوە، کە خۆی دامەزراندووەو باڵی بەسەر هەموو شارستانییەکانی تردا کێشاوەو هەندێك لە وڵاتان بەرگی داگیرکەرو شەڕاویان فڕێ داوەو بەهەموو شێوەیەك بەدوای کەوتوون و سوودی لێ وەردەگرن و، توانیتیان هەر لە دەنکە شقارتەو دەرزی تا ساروخی دوور هاوێژو مانگی دەستکرد.. هتد، بەڵام میللەتی ئیسلام و زۆربەی میللەتانی جیهانی سێیەم زۆر کۆسپ لەبەردەم هاتنە جێی حەزەکانیان هەن لە پێشکەوتنی زانستیو شارستانی کە هەندێکیان لەڕابردوودا ماوەنەتەوەو هەندێکیشیان بەهۆی پاشماوەی داگیرکەرانەوە بەجێ ماوە وەکو (بڵاوبوونەوەی نەخوێندەواریو کەمی پارەو کەمی سەرف کردنی لەلایەنی زانستییەوەو جێگیر نەبوونی هێمنیو ئاسایش و.. چەند هۆیەکی تر.

نکۆڵی لەو هەنگاوە باشانە ناکرێت کە میللەتانی ئیسلام هاویشتویانە لە لایەنی فێربوون و دروست کردن بەڵام کەسیش ناتوانی نکۆڵی لەوە بکات (ئەگەر ئەم میللەتانە لایەنی سیاسان ئارام باو فەرمانڕەوایەکی دادپەروەری باشیان هەبایەو پارەو پولیان لە شتی پێویست سەرف کراباو درێغی نەکرابا لە زانست و دابین کردنی هەموو پێویستیەکی) ئەوە نێوان میللەتانی ئیسلام و وڵاتە پێشکەوتووەکان زۆر لێك نزیك دەبوو ئەو وەختە دەیزانی بەدوای چی ئەگەڕێت و مەبەستی چییە!.





## لایەنە خراپەکانی شارستانیەتی ئێستا

سەرباری لایەنە چاکەکانی شارستانیەتی ئێستا، کەچی لایەنەکی خراپیشی هەیەو، لێك جیاکردنەوەیان زەحمەتە، چونکە تەواو کەری یەکن. هەر لەبەر ئەوەیە کە میللەتانی ئیسلام یان چینی زانایەکانیان لەو دیارییەوە وەستاون نازانن چۆن باشەکەیان وەربگرن بێ ئەوەی خراپەکەی لەگەڵ نەبێت.

شارستانیەتی سەردەم بە واتا گشتییەکەی زۆر ڕیساو شتی خراپی تێدایە کە دوورە لە ئایینی ئیسلام بگرە هەتا دوورە لەگەڵ هەموو ئەو شتانەی کە چاکەکان بانگەوازیان بۆ دەکرد لە خاوێنی نەفس و ئەوەی بۆ خۆمان پێ خۆشە ئەوهاش بۆ برامان خۆشمان بوێت.

کەواتە شارستانیەتێکی ماددیو خۆبەدی کەرە لە ئایینە ئاسمانییەکان، کە سەرپەرشتیکەری ئەم شارستانیەتە تەنها بیر لە قازانجە ماددیو خۆشییە جەستەیەکان دەکەنەوە. بەڵێ ئینکاری لایەنە باشەکانی شارستانیەت ناکەین لە پێشڤەچوونی فکرو زانست و کەمبوونەوەی دەردو نەخۆشییەکان و ئاسانکردنی ڕێگاوبان و چوونە ژێر زەریاکان و فرین لە ئاسمان و چوونە سەرمانگ و. هتد، بەڵام لەگەڵ تێکچوونی بیروباوەڕو لادان لەسەر بیرو باوەڕی ڕاستی ئیسلام، بەمەش ڕەوشتی خەڵکیان گۆڕیو حەزو ئارەزوویان خستە گەڕو، گەڕان بەدوای خۆشیو کۆکردنەوەی پارەو پول، قسوریان لە دروستکردنی کەل و پەل لەناوبەر نەکرد وەکو: (تۆپ و تەیارە) بەدوو چاو سەیری خەڵك دەکەن و بەدوو ربە دەپێون.

شارستانیەتی ئێستا بەهۆی بەلاوە نانی ئایینی ئیسلام تووشی دەیان نەخۆشی بووە. وەکو بڵاوبوونەوەی ماددە بێ هۆشکەرەکان و بڵاوبوونەوەی فەسادیو ڕەواجدانی فیلمەکانی خراپ و زەبرو زەنگ و بڵاوبوونەوەی نەخۆشی (ئەیدز) کە زانایان تووشبوانی بە (٤٠) ملیۆن کەس مەزندە دەکەن و، فرۆشتنی دەرمان و خواردنی خراپ و نەهێشتنی هاتنی کەل و پەلی پێشکەوتوو بۆ وڵاتانی تر و پێوەدانی دەرگای خوێندنگایەکانی لە بەردەم قوتابیانی وڵاتانی ترو ئەزیەت دانی ئەوانەی لە وڵاتانی ئەوان ژیان بەسەر دەبەن و دروستکردن و خەزن کردنی چەکی ناوکیو سەدان شتی تر.

**شارستانیەتی سەردەم زۆر ڕیساو شتی خراپی تێدایە کە دوورە لە ئایینی ئیسلام**

دەبێت ڕۆژێك بێت (ئەگەر نەگەڕێنەوە بۆ ئیسلام) لەناو بچێت، چونکە ئەو ستەمەیە کە دەبێتە هۆی لەناوچوون وەکو خودا دەفەرموێت: ﴿**وَتِلْكَ الْقُرَى أَهْلَكْنَاهُمْ لَمَّا ظَلَمُوا وَجَعَلْنَا لِمَهْلِكِهِمْ مَوْعِدًا**/ الکهف-٥٩﴾ کەواتە دەبێت لەگەڵ شارستانیەت بڕۆین و لایەنە خراپەکانی بەلاوە بنێین و هەموو پێویستییەکان ئامادە بکەین بۆ ئەوەی دوا نەکەوین.هەروەها سەرباری شارستانیەت دادپەروەریو خێرو خۆشی بڵاوبکەینەوە.




# پیرۆزبێت یادی ١٠٤ ساڵەی رۆژنامەگەری کوردی



سابیر حوسێن

بێگومان بۆ قسەکردن لەسەر رەوش و کاودانی رۆشنبیری‌و کایەی مەعریفی هەر جوگرافیاو نەتەوەیەك دەبێ سەرەتا بزانین، کە ئەو سنوورە یا نەتەوەیە دوێنێی بریتییە لە چی؟ بەچ بارودۆخ و تەنگژەو رۆژگارێکدا تێپەڕ بووە. شوێن و پێگەی لەکوێیە؟!

کەوایە هەر کاتێك بمانەوێت باس لەباری رۆشنبیری‌و مەسەلەی راگەیاندنی نەتەوەی کورد بکەین، ئەوا دەبێ هەموو ئەو کارەسات و رووداوو داگیرکردن و چەوساندنەوەو سانسۆرو دەمبەستن و قەدەغەکردنی زمان و سەرکوت کردنانەی درێژایی مێژوو لەبەر چاو بگرین، کەچ بەو گەلە ستەمدیدەیە کراوەو چۆن پێش بەهەموو خەون و ئامانج و تەنانەت بیرکردنەوەکانیش گیراوە. جا هەر لەم روانگەیەشەوە هەر نەتەوەیەك سیستەمێکی راگەیاندنی تایبەت بە خۆی بەرهەم دێنێ. رەنگە ئەگەر نەتەوەی کوردیش ئەو هەموو کلتوورو شارستانیەت و رابردووەی لێ گوم نەکرایەو مێژووەکەی نەشێوێندرایە زۆر زووتر دەستی بدایە کارێك کە رۆژنامەگەری‌و نووسین و بڵاوکردنەوەیە، کە ئێمە دەمانەوێ لێرەدا لەیادی ١٠٤ ساڵەی دەرچوونی یەکەم رۆژنامەی کوردی لە ١٨٩٨/٤/٢٢ بە ناوی (کوردستان) بەبەرزو پیرۆز یادەکە رابگرین و درودو سڵاو بۆ رۆحی میقداد مەدحەت بەدرخان و بنەماڵە نشتیمان پەروەرەکەی بنێرین و سەری رێز بۆ درێژە پێدەرو رێبواران و هەموو ئەو جوامێرانە رەوانە بکەین، کە پەنجەی خۆیان کردۆتە مۆم ز جەستەی خۆیان بە خۆڵەمێش بۆ رۆشنکردنەوەی ئەم رێگایەو لە خەمی فراژی بوون و پێشخستن و سەرخستنی رۆژنامەو وشەی شیرینی کوردیدا بوون. ئەوان





> **ئەگەر نەتەوەی کورد ئەو هەموو کلتوورو شارستانیەت و رابردووەی لێ گوم نەکرایەو مێژووەکەی نەشێوێندرایە رەنگە زۆر زووتر دەستی بدایە کاری رۆژنامەگەری**

درکیان بەوە کردووە، کە شۆڕشی رۆشنبیریو هوشیارکردنەوەی خەڵك دەکەوێتە پێش راپەڕین و سەرهەڵدان و هەڵشاخانەوە بەرووی جەورو زۆری دوژمن و داگیرکەرانەوە، لەبەر ئەوەی هەر شۆڕش و راپەڕینێك هەڵێنجراو و لەدایك بووی بیرکردنەوەو هزرو بیرێکی ساغلەم و دروست بێ سەرکەوتنەکەی مسۆگەر دەبێو دەستکەوتەکانیشی مەزنتر.

رۆژنامە فاکتەرێکی گرنگی هوشیارکردنەوەی خەڵکە. ڤۆلتێر دەڵێ: (رۆژنامە نووسی دەزگایەکە بەکەس ناشکێندرێت، بەلاّم ئەو جیهانی کۆن دەڕوخێنێ بۆ ئەوەی جیهانی نوێ پێك بێنێت). یاخود وتەیەکی زۆر بەناوبانگی ناپلیۆنی سەرکردەی فەرەنسا هەیە دەڵێ: (سێ رۆژنامەنووس لەسەد هەزار سەرباز زیاتر دەمترسێنن) لەمەدا رۆڵی گرنگ و پڕبایەخی رۆژنامەمان بۆ دیار دەکەوێت چۆن تەنیا سێ رۆژنامەنووس لەسەد هەزار سەرباز زیاتر کاریگەریان هەیەو دەتوانن ببنە چەکی بەرەنگاریو پاراستن و هوشیارکردنەوەی خەڵك. لەم روانگەیەشەوە کەڵەنووسەرو رۆشنبیرو رۆژنامەنووسانی کوردیش بەر لەسەدەیەك لە هەندەرانەوە دەستیان داوەتە ئەم کارو ئەرکە پیرۆزە کە لەم رێگایەوە بتوانن نەتەوە ژێر دەستەکەیان وشیار بکەنەوەو لەشەوەزەنگی غەفلەت و نەزانین و ژێرچەپۆکی داگیرکەران دەربازیان بکەن و کوردیش خاوەن دەنگ ورەنگ و دەوڵەت وئالاّی خۆی بێ.

خوای گەورەش دەفەرموێ: ﴿**هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لاَ يَعْلَمُونَ**/ الزمر-٩﴾ هەڵبەتە کەسێکی خوێندەوارو زاناو چاوکراوە لەیەکێکی نەخوێندەوارو بێئاگا لەکاروباری دونیا زۆر جیاوازەو هەمیشەش یەکەمیان دەیباتەوەو هەر ئەو سەر دەستەو فەرمانڕەواو ئالاّی پێشەنگی بەدەستەو دەتوانێ چاوی بەرامبەرەکەی ببەستێ، چیش مەبەست بێ بیکات و وەك داشی دامە وازی پێبکات. پێغەمبەری سەروەرو خۆشەویستمان هەر لەم روانگەوە کە خوای گەورە لەیەکەم ئایەتی قورئانی پیرۆز پێی دەڵێت ﴿**اقْرَأْ**/ العلق-١﴾ دەفەرموێت: (اطلب العلم من المهد الى اللحد) کەوایە دەبێ هەوڵەکانمان یەکخەین بۆ وەدەست هێنانی زانست وزانین و لێك جیاکردنەوەی رەش و سپی خۆمان لەمڕۆی دونیای پێشکەوتن و جیهانگەرایی‌و تەکنەلۆژیاو کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت، بەوەی ئەم ئامرازانە بوونە هۆکارو کەناڵی پەخشی راگەیاندن و، جیهانیان کردۆتە ئەودێیە بچکۆلانەی کەبچووکترین و مەزنترین رووداو لەوپەڕی دونیا لەماوەی چەند خولەکێکدا دەگاتە بەر دیدەو گوێمان و لە وردو درشتی مەسەلەکان ئاگادار دەبین. کە ئەوە رۆڵی کاریگەری راگەیاندن بێ، دەبێ ئێمەش زۆر بەبایەخەوە چاو لە راگەیاندن بکەین و بتوانین سوودی لێببینین و بەکارهێنانی بەقازانج بشکێتەوە بۆمان، چونکە




زۆرجار راگەیاندن دەتوانێ کار لەسەر رای گشتیو نەتەوەیەکگرتووەکان و ولاتە بالادەستەکان بکات، بۆ نموونە کۆڕەوی چەند ملیۆنی بەهاری ١٩٩١ لەچاوی کامیرەو لەسەر رووپەری رۆژنامەو کەنالەکانی راگەیاندن دەوری کاریگەری خۆی گێراو بەقازانجی دۆزی رەوای گەلەکەمان شکایەوەو بڕیاری ئەنجومەنی ئاسایشی پێدەرچوو، بەهۆیەوە چەکوشی ئامادەو ناوچەی پارێزراومان بۆ دابین کرا. بەلام من لێرە دەمەوێ ئاماژە بە شتێکی زۆر گرنگ و جێگەی سەرنج بکەم لە حزوری مامۆستایانی ئایینی. کە ئەوانیش هەردەم کەنالێکی کاریگەرو زۆرحەساس و راستەوخۆ گرێدراون بە زۆربەی چین و توێژەکانی نەتەوەکەمانەوە، بەوەی دەتوانن رۆلی بەرچاوی خۆیان بگێڕن لە وشیارکردنەوەی خەلك و جەماوەری کوردستان و مێشکیان بە ئامۆژگارییەکانی قورئان و فەرموودەکان و رێوشوێنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام زاخاوبدەن و لەگەل رووداوەکانی رۆژو زەرورەتی کۆمەلگاکەمان برۆن بەرێوە. لەمەترسییەکان ئاگاداریان بکەنەوە، ئەرك و مافەکانیان بۆ روونبکەنەوە. لەوەدلنیایان بکەنەوە کە پاراستنی نیشتمان و ئەو ئەزموون و حکومەتە بەشێکە لە باوەڕ بوون بە خواو پێغبەری خوا (حب الوطن من الایمان). ئەرکی مامۆستایانی ئایینیە بەر لەدەزگاکانی راگەیاندن کە بەو کوردە مەزلوومە بلێن: (الاسلام امة واحدة) بەلام ئەودەمەی لەژێر پەرچەمی(الله اکبر)و بەناوی پیرۆزی سورەتی ئەنفال ١٨٢ هەزار گیان چارەنووسیان دەخرێتە پشت پەردەی تاریکییەوەو کچ و ئافرەتی کورد وەکو کەنیزەو جاریە دەفرۆشرێو پیرو مندال بەزیندوویی چاویان پڕ خول دەکرێ، تەنیا تاوانەکەشیان ئەوەیە، کەهەلگری ناسنامەی کوردی بوون. نە ولاتێکی ئیسلامیو نە رێکخراوو حزبێکی ئیسلامی ورتەیان لەدەم نەهاتەدەر. ئەم پرۆسەو کارە مەبەستم لە ئەنفالە بەدناوەکەی سالی ١٩٨٨، کە رژێمی بەغداو بەعسی فەرمانڕەوا بە بالای خەلکی بێ دیفاعی نەتەوەکەمیان دابڕی بۆ منی موسلمان نییە. ئێمە نەتەوەیەکین بە زۆرینە ئیسلام. با بەهەموولایەك نەهێلین جیهان بە کافرو زەندیق و لەرێ لادەرو یاخیمان تێبگەن. پێویستە ستراتیژو ئامانجەکان کۆمان بکاتەوە. بەهەر وەسیلەو رێگایەك بێت، لە هەموو کەنالەکانی راگەیاندن لە بچووکترین دەرفەت سوود وەربگرین لە پێناو سەرخستن و دابین کردنی دوا رۆژێکی ئاسوودەو پرشنگدار بۆ ئەو نەتەوە مەزلوومەی کە چەندین سەدەیە شەکەت ومانداووە لەژێر چەکمەو پۆستالی داگیرکەرو ناحەزان.

شکۆداربێت یادی ١٠٤ سالەی رۆژنامەگەری کوردی.

شادرەوان بێ رۆحی بەرزە فڕی سەر قافلەی رۆژنامەنووسان میقداد مەدحەت بەدرخان.

**هەر شۆرش و راپەرینێك لەدایك بووی هزرو بیرێکی ساغلەم و دروست بێ سەرکەوتنەکەی مسۆگەر دەبێ**




# راگەیاندراوی سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان لەسەر ئەو دەست درێژییەی کراوەتە سەر کاك عەبدولقادر بریفکانی رۆژنامەنووس




رۆژی چوارشەممە رێکەوتی ٢٠٠٢/٢/١٣ لەهۆتێلی ماریوت لەلەندەنی پایتەختی وڵاتی بەریتانیا جەوهەر سورچیو دوو کەسی تر لەگەڵ ناوبراودا بوون بەشێوەیەکی رقە کوێرانەو دوور لەهەموو داب و نەریتێکی مرۆییو مەدەنی دەست درێژیان کردە سەر کاك (عەبدولقادر بریفکانی) نووسەرو رۆژنامەنووس و ئەندام لەسەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان، ئەم دەست درێژییەش لەسۆنگەو دەرەنجامی ئەوەوە هاتووە کە مانگی حوزەیرانی پارساڵ کەناڵی ئاسمانی (ANN) مێزگردێکی بۆ بەرێزان د.مەحموود عوسمان و عەبدولقادر بریفکانیو جەوهەر سورچی سازدابوو کە لەوێدا جۆرێك لەگرژیو تێك گیران لەنێوان کاك عەبدولقادر بریفکانیو جەوهەر سورچی روویدابوو بەتایبەتیش جەوهەر سورچی کەوا لەم مێزگردەدا لەهەندێك خاڵ و رستەدا پەیرەوی مەبدەئی دیالۆگ و گفتوگۆی شارستانیی نەکردبوو، دیارە ئەو دەست درێژییەی ٢٠٠٢/٢/١٣ لەلایەن جەوهەر سورچیو یاوەرەکانی هەڵ گێرانەوەی مەبدەئی دیالۆگ و لێك تێگەیشتنە بەو حاڵەش شەڕو توندوتیژیو ئازاردانی جەستەیی کە لەهیچ سات و قۆناغێکداو بەتایبەتیش لەسەردەمی ئێستا لەگەڵ پرەنسیپەکانی دیموکراسیەت و مافی مرۆڤ و زمانی شارستانیانەی گفتوگۆی ئازادو بیروڕای جیاواز ناگونجێت، بەتایبەتیش شەڕو ئازاردانی جەستەی مرۆڤ بەهەر بڕوبیانووێك بێت دەچێتە خانەی ئیرهاب و کاری توندوتیژی هەر بۆیەش ئێمە لەئەنجومەنی سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان ئەم دەست درێژییەی سەر کاك عەبدولقادر بریفکانی مەحکوم و پرۆتستۆ دەکەین و داواش لەسەرجەم رۆژنامەنووسان و هەڵگرانی قەڵەمی پاك و بەتەنگەوە هاتووان و داکۆکی کارانی ئازادی بیروڕا دەکەین مەحکومی هەموو ئەو جۆرە دەست درێژی کردنانە بکەن، تاکو هەوڵ و تواناو وزەی رۆشنبیریو قەڵەمی هەموو لایەکمان بخرێنە گەڕ بۆ زیاتر قوڵ کردنەوەی بنەماکانی دیموکراسیەت و چەسپاندنی ئازادی بیروڕا، بەهێزکردنی پایەکانی ئەزموونی کوردستان.

**ئەنجومەنی سەندیکای**

**رۆژنامەنووسانی کوردستان**

**٢٠٠٢ / ٣ / ٣١**







پرۆفیسۆر جیراڵد شالیاند:

# کورد رۆڵێکی کاریگەری دەبێت لەئایندەی عێراقدا

یەکێك لە دۆست و شارەزاکانی کێشەی گەلانی ژێر دەستە نووسەری گەورەی فەرەنسیو دۆستی دێرینی گەلی کورد پرۆفیسۆر (جیراڵد شالیاند)ە کە نزیکەی چل ساڵە لە نزیك و دوورەوە چاودێری گەلی کوردو دۆزەرەواکەی دەکات و شارەزاییەکی تەواوی لەسەر هەموو پارچەکانی کوردستان هەیەو بەسەردانی مەیدانیو لەکاتی شۆرشی چەکداریو پارتیزانی گەلی کورددا سەردانی پێشمەرگەکانی کوردستانی کردووە. ماوەیەك لەمەوبەر ناوبراو لەسەردانێکی بەسوودا گەیشتە کوردستان و ئێمەش بەباشمان زانی لەسەر چەندین مەسەلەی گرنگ و پەیوەندیدار بەگەلی کوردو کێشەی عێراق و رۆژهەلاتی ناوەراست و رووداوەکانی دوای ١١ی سێپتێمبەری ئەمریکاو کاریگەری ئەو رووداوە لەسەر ئایندەی ناوچەکەو جیهان چەند پرسیارێکی ئاراستە بکەین:

*** پێشتر سەردانی کوردستانت کردووە؟ دەکرێت هەلسەنگاندنێکمان بۆ بکەیت لەنێوان ئەو چەند جارەی کە هاتوویتە کوردستان.**

**- بەرێز جیراڵد شالیاند:** گۆرانکارییەکان گەورەن بەتایبەتی لەبواری ئاوەدانکردنەوەو زانست و رۆشنبیری، هەست بە رەزامەندی گەلی کورد لەدوای رووداوەکانی بەهاری ١٩٩١ و جەنگی دووەمی کەنداو دەکەم. ویستگەی یەکەمی سەردانەکەم لەپارێزگای دهۆك بوو کە لەوێدا موحازەرەیەك یان سیمینارێکم لە ئەکادیمیای سەربازی




پێشکەش کرد بەو ئەفسەرو قوتابیانەی کە لەوێدا کاردەکەن و بینیم کە سووربوون هەیە لەسەر گەیشتن بە سستمێکی ئەکادیمی بۆ ئەفسەرو دەرەجەدارەکانی کوردستان.

* چەند کتێبێکت هەیە لەسەر ئایندەی سیاسی جیهان. هەروەها لەسەر کوردستان دوو کتێبت هەیە، دەکرێت لەبە نجامی ئەو شارەزاییەی کە لە چل ساڵی رابردوودا لەسەر دۆزی کورد پەیدات کردووە رێنەیەکمان لە ئایندەی کوردستان پیشان بدەیت؟

- بەڕێز جیراڵد شالیاند: پرسیارەکە شمولیە، چونکە کوردستان زیاتر لە (٢٠) ملیۆن کورد دەگرێتەوە کە ئێستا لەسەر ئەرزی واقیع لەسەر خاکی خۆیان دەژین. دەبێ لێم ببورن ئەگەر بڵێم تەنها (٢٠) ملیۆن، چونکە ئەوەی تێگەیشتوم لە کوردستان تەنها ئەو ژمارەیە لەسەر ئەرزی واقیع و بەئاشکرا باس لە کێشەی کوردو ژێر دەستەیی دەکەن، لەوانەیە زیاتر لەو ژمارەیە کورد لەناوچەکەدا هەبێت، بەڵام بەهۆی چەند سانسۆرو تایبەتمەندی پارچەکانی کوردستان بەشێك لەگەڵی کورد ئامادە نییە خۆی بگلێنێتە کێشەیەکەوە کە تا ئێستا بەرەسمی گەرەنتی پاراستنی نەدراوە. بەڵام بەهەر حاڵ دەتوانم پێتان بڵێم کە ئەو شێوازەی بەرامبەر کورد گیراوەتەبەر لەهەموو پارچەکاندا بەرێژەی نزیکەیی لەیەکتر دەچێ یان لەچەند خاڵێکدا کۆ دەکرێتەوە کە ئەمانەن:

١. دروستکردنی رێگاوبان بۆ گەیشتن بەهەموو قوژبنێکی کوردستان لەهەموو پارچەکانی کوردستاندا. دیارە ئەوەش بۆ ئاوەدانکردنەوەی کوردستان نەبووە، بەڵکو بۆ ئاسانکردنی گەیاندنی کۆمەکی سەربازی بۆ سوپای داگیرکەری کوردستان و پاراستنی پێگە سەربازییە سەرکوتکەرەکانیان.

٢. کۆکردنەوەی خەڵکی لەشارێکدا یان لە کۆمەڵگایەکدا بۆ ئەوەی زیاتر لەژێر کۆنترۆڵدا بێت و سەرکوتکردنیان ئاسان بێت.

٣. گواستنەوەی بەزۆری گەلی کورد لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر ئەو شوێنەش چەند کرابێت دوورتر بێت ئەوا بۆ سستمە سیاسییەکانی ئەو وڵاتانەی کوردیان تێدابووە باشتر بووە. ئەوەش وایکردوە کە ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوانی کوردستان هەمیشە لە ئاوارەییدا بژین.

٤. کڕینی چەند کەسێك لە دانیشتوانی کوردستان لەلایەن حکومەتە ناوەندییەکانەوە بۆ ئەوەی زۆربەی جموجۆڵە سیاسی و سەربازی و رۆشنبیرییەکانی گەلی کورد بگەیەنێت و بەخێرایی سەرکوت بکرێت.

* ئەگەر بکرێت زیاتر پێشبینی و بۆچونمان لەسەر ئایندەی کوردستان بۆ روون بکەیتەوە؟

- بەڕێز جیراڵد شالیاند: تائێستا پێت نەوتم مەبەستت لە کوردستانی عێراقە یان هەموو کوردستان، بەڵام دیارە زیاتر مەبەستت هەرێمی کوردستانی عێراقە. لێرەدا من وای دەبینم کە گەلی کورد لە کوردستانی عێراقدا ئەزمونێکی سەرکەوتوویان پیادە کرد ئەگەر چی لەکەم و کوڕیش بەدەرنەبوو، بەڵام هێشتا داواکاری سیاسی و رۆشنبیرییەکانی کورد هەر لە چوارچێوەی عێراقدا دەبینم، چونکە هەستم نەکردووە هەرێمی کوردستان خواستی جیابوونەوەی هەبێت لە عێراق




ئەوەش بێگومان لەبەرژەوەندی گەلی کورددایەو زۆر بە باشی لەگەڵ رەوشی ئەمڕۆی ئیقلیمیو جیهانی گونجاوە. پێویستە کەباس لە ئایندەی کوردستان دەکەین باس لە ئایندەی عێراقیش بکەین کە بەبۆچوونی من لە دەست ئەمریکادایە. جا ئەگەر ئەمریکا بڕیاریدا گۆڕانکاری لە عێراقدا بکات (کە بە بۆچوونی من دەیکات) ئەوا ئەو کات لەهەر کەس زیاتر پێویستی بەخەڵکی عێراق هەیە. گومانیشی تێدا نییە ئەزمونی ئەم ساڵانەی دوای ساڵی ١٩٩١ هاندەرێکی باشە بۆ ئەمریکا و کۆمەڵگای نێو دەوڵەتی تا لە عێراقی ئایندەدا کورد پێگەیەکی شایستەی هەبێت.من وا دەبینم کە لە ساڵی داهاتوودا دۆسیێی عێراق لەلایەن ئەمریکاوە دەکرێتەوە، چونکە هێورکردنەوەی بارودۆخی ئیسرائیل و فەلەستین چەند مانگێکی دەوێت. جا ئەگەر ئەمریکا بڕیاریدا کە دۆسیێی عێراق بکاتەوە ئەوا من پێم وایە گەلی کورد لە عێراقدا داوای گەرەنتی دەکات و ئەو گەرەنتیەشی دەدرێتێ.

* دیارە بڕیاری ٦٨٨ی ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی لەلایەن فەرەنساوە بەردی بناغەی بۆ دانرا. سەردانی بەڕێزیشتان بۆ کوردستان لەساڵیادی دەرچوونی ئەو بڕیارەدایە. دەکرێت ئەم سەردانە هیچ پەیوەندیەکی هەبێت بۆ جوڵاندنی ئەو بڕیارەو گفتوگۆ کردن لەگەڵ سەرکردایەتی سیاسی گەلی کورد؟

- بەڕێز جیراڵد شالیاند: لەراستیدا من بۆ مەسەلەی بڕیاری ٦٨٨ نەهاتوم. بەڵکو تەنها بەرێکەوت سەردانی من بۆ کوردستان کەوتووتە ئەو رۆژەی کە بڕیاری ناوبراو لەلایەن ئەنجومەنی ئاسایشەوە دەرچووە، لەراستیدا من بڕیار بوو لە کۆتایی ساڵی رابردوودا سەردانی کوردستان بکەم، بەڵام رووداوەکەی ١١ی سێپتێمبەری ئەمریکا بووە هۆی ئەوەی کە سەردانەکەم تا ئێستا دوا بکەوێت.

* ئایندەی پەیوەندییەکانی گەلی کورد لەگەڵ وڵاتە ئیقلیمیەکاندا چۆن دەبینی؟

- بەڕێز جیراڵد شالیاند: ئەمە پرسیارێکی گرنگە، چونکە ئەو پەیوەندییەی کە تۆ باسی دەکەیت سەنگی مەحەك دەبێت بۆ ئاسایشی ناوچەکە بە گشتی. بۆ نمونە تورکیا لە هەوڵی خۆی بۆ بەئەندام بوون لە رێکخراوی (E.U) دەیەوێت بەسەر کێشەی کورد دا باز بدات، بەڵام خوالێخۆشبوو تورگۆت ئۆزال ساڵی ١٩٩٢ دانی بەوەدانا کە نزیکەی (١٢) ملیۆن کورد لە تورکیا هەیە. ئەم ژمارەیە لەوانەیە زۆر ورد نەبێت، بەڵام ئەگەر واش بێت ئەوا دەبینین گەلی کورد ٢٠٪ی دانیشتوانی تورکیا پێکدێنێت کەواتە ئەوروپا مافی خۆیەتی ئەگەر چارەسەرکردنی کێشەی کورد بکاتە یەکێك لە مەرجەکانی بە ئەندامبوونی تورکیا (E.U). لە عێراق و ئێرانیش بەهەمان شێوە گەلی کورد نەتەوەی ژمارە (٢)ە کەواتە ناکرێت دەوڵەتە ئیقلیمییەکان بۆ هەتا هەتایە لەم راستییە رابکەن و پێویستە بەدوای شێوازی سیاسیدا بگەڕێن بۆ پێکەوە ژیان لەگەڵ گەلی کورد. سەبارەت بە رۆڵی ئیسلامییەکانیش لە کێشەی کورددا من حەز دەکەم بۆچوونی خۆم دەرببڕم، دیارە جیهانی ئیسلامی تەنها لە وڵاتانی عەرەبی پێك نەهاتووە، بەڵکو بەشی گەورەی موسڵمانانی




جیـهان لــه ئەندەنووســیاو پاکسـتان و وڵاتــانی تــردان، کوردیـش بــه حوکمــی ئــەوەی کەمیللەتێکی زۆرینه موسـڵمانن بەهــەمان شــێوه شــانازی بــه موسـڵمانیەتی خۆیـان دەکـەن، بەڵام من دەبینم هەندێك له حزبه ئیسلامییەکان دەیانەوێت لـەژێر نـاوی ئیسـلامدا نـەژادی گـەلان بسـڕنەوە، ئەمــەش هەڵەیــەکی گەورەیـه بۆ نمونـه مـن لـەکاتی ســەردانمدا بــۆ ئــێران (دوای سـەرکەوتنی شۆڕشـی ئیسـلامی ئێران) پرسـیارم کـرد کـه ئایـا ڕۆڵی نەتەوەی کورد چی لێدێت؟ هەندێك له ئێرانیەکان پێیان وتم ئێمـه هــەموومان موسـڵمانین و گرنـگ نییــه بـاس لەنەتـەوەکان بکەین. کـەچی مـن لـه ئـەنجامی لێکۆڵینـــــەوەکانمدا بـــۆم دەرکــەوتووه کـــه توندڕۆتریــن حزبـی ئیسـلامی پێـش هــەموو شتێك سۆزی نەتەوەکـەی خۆی لەلا دەجوڵێ بۆ نمونه کاتێك له فەرەنسا له موسڵمانێکی ئێرانیم پرسـی تۆ خەڵکی کوێیت؟ پێـی نەوتم کـه مـن موسـڵمانم، بەڵکو گوتـی مـن ئـێرانیم، فارسـم. ئـەم نمونەیه بەسەر تورك و عەرەب و ئەندەنووسیو پەشتونیو هتد دوپــات دەبێتـــەوە. کەواتـــه کوردیــش مــافی خۆیــەتی کــه لەگـەڵ ئاینەکـەیدا شـانازی بـه نەتەوەو نەژادی خۆی بکات.

*** دوا پرسـیارمان لەسـەر ئایندەی جیهانە، بەتایبەتیش پـەیوەندی نێـوان ئـەمریکاو ئەوروپا دوای ڕووداوەکانی ١١ی سێپتێمبەر بەڕێزتان پێشبینی دەکەن تاك جەمسەری درێـژەی هەبێت؟**

- **بەڕێز جیراڵد شالیاند:** من پێم وایه ئەمریکا تا نیو سەدەی تر ڕۆڵـی سەرکردایەتی خۆی له جیهاندا دەپـارێزێت و ڕکابـەری ئـەوتۆی بـۆ دروسـت نـابێت. دەبینـین لـه کـاتێکدا یـەکێتی ئـەورووپا هـێزێکی ئـابووری گـەورەی لـه جیهاندا پێکـهێناوە، کـه لـه ئابووری هاوپەیمانیـەتی (ئـەمریکاو کەنـەداو مەکسـیك) بــەهێزترە، کـــەچی لـــه چارەسەرکردنی کێشەی بۆسنەو کۆسۆڤۆ ئەوروپا نەیتوانی بەبێ ئـەمریکا کێشـەکان چارەســەر بکات. لەسەر ئاستی جیهانیش من وا دەبینم که پاش نیو سەدە (چین) دەبێتـه وڵاتێکـی گـەورەو جێگـا بـه ئـەمریکا لـەق دەکـات، بــەڵام سیاســەتی پێکــهێنانی هاوپەیمانی نوێی وەك پاکستان و ئەفغانسـتان و هندسـتان بەشێوەیەکی تەدریجی (چین) له ڕکابەرایەتی دوور دەکەوێتەوە.

لە (حەکیمەکانەوە) دەگێڕنەوە، دەڵێن:

**(( صدور الاخيار قبور الاسرار ))**

**سینەی پیاوچاکان گۆڕی نهێنی‌یە**





# کاریگەری ژینگەو بۆماوەیی لەسەر کەسایەتی مرۆڤ

راپۆرتی: عەبدولڕەحمان مەعروف

زیاتر لە دوو سەدەو نیوە کوردستان بێ ویستی خۆیو بەزۆری ژێر دەستەو دواتریش بەسنوورێکی دەستکرد دانیشتوانەکەی دابەش و لێک جیا کراوەتەوە. داگیرکەران گەلەکەی دەچەوسێنەوەو سەروەت و سامانەکەی دەدزن. بێگومان هەمیشەش داگیرکەران بە بەرنامەو پلانێکی داڕێژراوەوە بەدوای سڕینەوەی ناسنامەی کوردو لەباربردن و شێواندنی کەسایەتییەکەیەوە بوون. لەوەشدا نەبوونی ئازادیو بێ دەسەڵاتی نەتەوەی کوردی بێ کیان و دەولەت و سەردەستە بوون و باڵا دەستی داگیرکەران توانیویانە تا رادەیەکی زۆر لە هەوڵەکانیان سەرکەوتووبن، بەوەی بونیادێکی لاوازو لەرزۆك، کەسایەتییەکی شێوێندراو وەبەربێنن. ئەوەشیان بۆ گەیشتن بە دوا ئامانج و خەونە گڵاوەکانیان و بەیەکجاری لەباربردنی شیرازەی کۆمەڵگەی کوردیو سڕکردن و پەکخستنی جەستەو رۆحیەتی نەتەوەی کورد گرتۆتە بەر. بەڵام هەرگیز کوردیش ملی بۆ خواستەکانیان نەداوەو پارێزگاری لەبوون و کەسایەتی خۆی کردووە، ئەگەر لە بەرامبەریشدا گەورەترین سەرمایەو گیانیش کەوتبێتە مەترسییەوەو لەدەستیشی دابێت. جا بۆ پەنجە خستنە سەر زامەکان و گرفتی کەسایەتی مرۆڤی کوردو گرتنی رێو شوێنێك بۆ رۆنانەوەی ئەم کەسایەتییە، لە گۆڤاری خۆری ئیسلام ئەم راپۆرتەمان ئامادە کردووە:

*** بەر لە هەر شوێن و جێگایەك روومان لەبارەگای یەکێتی زانایانی کوردستان کردو پرسیارێکمان ئاراستەی مامۆستا مەلا محەممەدی وەرتی کرد، بەوەی ئایا رۆنانی کەسایەتی ئادەمیزاد لە خودی خۆیەوە (بۆماوەیی) سەرچاوە دەگرێت یان دەوروبەرو ژینگە شوێن پەنجەی خۆیان دادەنێن؟ لە وەڵامدا بەرێزیان فەرمووی:-**

بێ گومان کەسایەتی دووبابەتە یان دوو لایەنی هەیە. یەکەمیان سروشتییە، واتە دەوروبەرو رۆژگار رۆڵی تێدا ناگێڕن، وەك: عەقڵیو زیرەکیو توانایيو پێکراییو ناسینی زیان و قازانج، وەك خوا دەفەرموێت: ﴿ **فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا** / الشمس-٨﴾ واتە: خوا هەستکردن بە زەرەرو




قازانجی لەنێو دەروونی هەموو گیانلەبەرێکدا ڕوناوە، هەموو گیانلەبەرێك قازانج و زیانی خۆی دەزانێ، تەنانەت زیندەوەرە هەرە وردەکانیش. بەچاوی خۆم مێرولەیەکم بینی خەریکی ڕاکێشانی بەردێك بوو بۆ کونەکەی خۆی، کاتێکیش بەردەکەی لەزاری کونەکە لێ عاسێ بوو ئیدی بەردەکەی جێهێشت و چووە ناو کونەکەی بانگی مێروویێکی دیکەی کردو بەهەردووکیان بەردەکەیان ڕاکێشا ژوورەوە. یاخود کاتێك تۆ دەست لە تاکە هەنگێك دەوەشێنی، ئەوە ڕادەکاتە ژوورەکەیو کۆمەڵێك هەنگ لەگەڵ خۆی دێنێو بەکوڵتی وەدەنێ.

بابەت و لایەنی دووەمیش. وەك: دینداریو زمانەوانیو خورەوشت و ڕێزو بەخۆوەگرتنی شەرم و ئابروو، کە ئەمانە کەسبین و دەوروبەرو ڕۆژگار ڕۆڵی تێدا دەگێڕن، پێغەمبەری ئیسلام دەفەرمووێ: (**کل مولود یولد علی الفطرة فأبواه یهودانه وینصرانه أو یمجسانه**) واتە: هەموو منداڵێك کە خوا دروستی کرد ئامادەیە بۆ لەئامێز گرتنی ئایین، ئەگەر لێی گەڕێن بەخۆی خواناسین دەدۆزێتەوە، بەڵام باوك و دایکی یان ژینگەو چواردەوری دەیخەنە سەر ئایینی جولەکە یان دیان یاخود ئاورپەرستی. دیارە لەم بابەتەدا دەوروبەر ڕۆڵ دەگێڕێت.

لێرەدا ئەو پرسیارە دەکرێت، کە ئینسان (مسیرة) یان (مخیرة) واتە: کە خەڵك چاکە دەکات یاخود خراپە بەواتای بەدەست خۆیەتی یان ناچارە. هەڵبەتە ئەنجامدانی هەر کارو کردەویەکیش بەویست و دەستی خۆیەتی. ئەگەر دەڵێن هیچ شتێك بەبێ ئیرادەی خوا نابێت، ئەمە ڕاستە، بەڵام زانایانی علمی کەلام دەڵێن ئیرادەی خوا تابیعی ئیرادەی بەندەیە. بەمانای خوای گەورە دەسەڵاتی داوەتە مرۆڤ لە هەڵبژاردنی چاکەو خراپە ﴿**فَمَنْ شَاءَ فَلْيُؤْمِنْ وَمَنْ شَاءَ فَلْيَكْفُرْ**/ الکهف-٢٩﴾ ئایا کە ئادەمیزاد کارێك دەکات بەخۆی چی کردو خوا چی بۆ کرد؟ لە وەڵامی ئەم پرسیارەش زانایانی زانستی کەلام دەڵێن: (الخلق من الله والکسب من العبد) بەواتەی: خەلق و دروست کردن بۆ خوا دەگەڕێتەوەو کەسبیش بۆ بەندەکان. ڕاستە خوا دەفەرمووێ: ﴿**وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ**/ الصافات-٩٦﴾واتە: خوا ئێوەو کرداری ئێوەی دروست کردووە. بەو مانایەی دروست کردنی هەردووکیان بۆ خوا دەگەڕێتەوە. بۆ کەسبیش دەفەرمووێ: ﴿**لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ** /البقرة-٢٨٦﴾ کە مرۆڤ چاکە بکات قازانجی خۆیەتی، خراپەش بکات بەزیانی خۆی تەواو دەبێت. واتە ئەم ئایەتە پیرۆزە دوو خاڵی گرنگی بەخۆوە گرتووە. یەکەم: کەسب بۆ بەندەو ئادەمیزاد دەگەڕێتەوە. دووەم: هەر لەبەر ئەمەیە مرۆڤ بە ئەنجامدانی کاری چاك پاداشت وەدەست دێنێ، لە خراپەش سزا دەدرێت بەواتای تاوانبارە.

زانایەك بەناوی عەمری کوڕی عوبەید دەگێڕێتەوە: لە سەفەرێك لەناو کەشتی بوومە هاوەڵی ئاور پەرستێك. پیاوەکەش پیاوێکی زۆر قسە خۆش و دڵگر بوو. لە خۆشەویستی پێم گوت: بۆ موسڵمان نابیت. ئەویش لە وەڵامدا گوتی: خوا ئیرادەی نەکردووە. خوا ئیرادە بکات ئیسلام دەبم. دەڵێ منیش گوتم: خوا ئیرادەی کردووە تۆ ئیسلام بیت، بەڵام بە ئیختیارو ویستی خۆت، ئەگەر تۆ ئیسلام بوونەکەت ئیختیار نەکەی خوا بەزۆر ئیسلامت ناکات، ئەو دەسەڵاتی پێداوی، لەبەر ئەوە دنیا قوتابخانەی تاقی کردنەوەیە تەنیا دەسەڵات و ئامادە سازی بە خەڵك

دەدات، وەك دەفەرموویت: ﴿خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً/ الملك-٢﴾ واتە: خوا مردن و ژیانی بۆ ئادەمیزاد دانا تا لەدوا ڕۆژدا تاقیان بکاتەوە، کێ کردەوەی باشە پاداشی خۆی وەردەگرێو ئەوەی کردەوەی خراپە بەسزای خۆی دەگات. کەواتە لەم ڕوانگەیەشەوە هەمان مەسەلە دێتە پێشەوە، کە هەردوو باڵ دەرەوەو ناوەوە، بۆماوەیی‌و دەورووبەر لەسەر بونیادی کەسایەتی‌و کارو کردەوەی ئادەمیزاد ڕۆڵ دەبینن.

* دکتۆر یوسف حەمە ... مستەفا پرۆفیسۆری یاریدەدەر لە دەروونزانی‌و کەسایەتی لەمەڕ پرسیاری ئایا دروستبوونی کەسایەتی بۆماوەییە یاخود ژینگەو دەروروبەر ڕۆڵی سەرەکی دەبینن؟ بەڕێزیان دەڵێ:-

کەسایەتی مرۆڤ دروستکەری کارلێکەری هەردوو کۆمەڵە هۆکارە، کە پێیان دەوترێت: هۆکاری بۆماوەیی‌و هۆکاری ژینگەیی. لەڕاستیدا ئەو دوو هۆکارە سەرەکین بۆ کارکردنیان لەسەر گەشەپێدانی هەر زیندەوەرێك و ڕووەکێك، واتە پێویستە بۆ ئەوەی کەسایەتی دروست بێت هۆکاری بۆماوەیی هەبێت، کە بریتییە لەو سیفاتانەی کە لەنەوەی پێشوو (دایك و باوك) بۆ نەوەی داهاتوو لەڕێگای (جینات)ەوە دەگواسترێنەوە بەپێی پرۆگرامێکی نەخشە کێشراو لەکات و ژینگەی گونجاو. ئەو سیفەتانە زۆر شت دەگرێتەوە وەك ڕەنگی پێست و چاو و قژو درێژی‌و لایەنە جەستەییەکانی ترو هەروەها هەندێ لایەنی دەروونی‌و نەخۆشی دەگرێتەوە.

هۆکاری ژینگەییش بریتییە لە هەر فاکتۆرێ، کە کاردەکاتە سەر کەسایەتی لە دەرەوەی مرۆڤ وەك ئاووهەواو خۆراك و خێزان و پەروەردەی کۆمەڵایەتی‌و مامەڵەی دایك و باوك لەگەڵ منداڵ و قەوارەی خێزان و باری ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و فێربوونی خێزان بەتایبەتی دایك و باوك و ڕادەی یەکگرتووی خێزانەکەو نەبوونی ئاژاوەو ناکۆکی‌و ململانێ... ئینجا لە دوایدا ڕۆڵی دەزگاکانی کۆمەڵ وەك هۆکارە ژینگەییەکان دەردەکەوێت لەسەر کەسایەتی بەتایبەتی قوتابخانەو هۆیەکانی ڕاگەیاندن.. هتد. ڕاستە جاری وا هەیە خاوەنی یەکێك لەو دوو قوتابخانەیە زیادە ڕۆیی (تطرف) دەکەن، کە دەڵێن ژینگە یا بۆماوە کاریگەرترەو سەرەکی ترە لەسەر کەسایەتی، بەڵام هەردوو هۆکار گرنگ و سەرەکین و کەسایەتی هەرگیز بەبێ هیچ کامێکیان دروست نابێت. هەڵبەتە کۆمەڵگەی کوردیش لەمە بێ بەری نییەو، هەر یەکە لەم دوو هۆکارە ڕۆڵی خۆی لەپێکەوەنانی کەسایەتی مرۆڤی کورددا دەبینێت.

* هەمیشە دوژمن و داگیرکەرانی کوردستان هەوڵی داروخان و شێواندنی کەسایەتی مرۆڤی کوردیان داوە. جا لە ڕوانگەی زانستی کۆمەڵایەتییەوە چ ڕێگا چارەیەك بگرینە بەر؟ ئەم پرسیارەش مامۆستاو قوتابی دکتۆرا عەبدوڵڵا خورشید لەبەشی کۆمەڵناسی کۆلێژی ئاداب بەم شێوەیە وەڵامی داینەوە:-

لەبەر ئەوەی کەسایەتی مرۆڤی کورد، وەکو هەر ئادەمیزادێکی دیکەی سەر ئەم زەمینە لە چەند ڕەهەندو لایەنێك پێکهاتووە، لەوانیش لایەنی جەستەیی‌و لایەنی دەروونی‌و لایەنی کۆمەڵایەتی، بۆیە پێویستە حیساب بۆ هەر یەکێك لەو لایەنانە بەتەنیاو بەئاوێتە بوونیشیان پێکەوە بکرێت.

ئەوە لە لایەکەوە، لەلایەکی تریشەوە بۆ لاواز کردن و خەفە کردن و لەتوانا خستنی کەسایەتی





مرۆڤی کورد چەندەها هۆکارو ڕێگەو ئامراز وەگەڕ خراوەو ئەو پرۆسەیەش چەندان ساڵی پێچووە. بۆیە پێویستە هەموو ئەو بابەتانەش لەبەر چاو بگیرێن هەر وەکو شاعیری عەرەب دەڵێ: (وداوني بالتي هي الداء) واتە: هەر بەو بابەتە کەتووشی دەردەسەری کردووم، چارەسەرم بکە. بۆ وێنە ئابوورییەکی دواکەوتوو، پەیوەندی کۆمەڵایەتی نا ئاسایی‌و نایەکسان و بێ ئامانج و دام و دەزگای سیاسی سەرکوتکەرو تۆقێنەر یان بێ تواناو بێ کەڵك، هەروەها خێزانی بێ تواناو بێ سەرپەرشتی‌و قوتابخانەی بێ دەسەڵات لە پەروەردەی منداڵان و هۆکاری ڕاگەیاندنی بێ کەڵك، هەموو ئەمانە بەرپرسیارن لە لاواز کردن و هەرەس پێهێنان و لەرزۆك کردنی کەسایەتی مرۆڤی کورد. جا ئەو هەموو لایەنانە چ بە مەبەست و ئەنقەست ئەو کاریگەریە سلبییە بخەنە سەر مرۆڤی کورد، یانیش بەهۆی نەزانین و بێ توانایی‌و کەم شارەزایی ئەو لایەنانەو کارمەندانەوە بێ...ئەنجامەکە هەر یەکەو شکست و داڕمان و پەککەوتنی کەسایەتی مرۆڤی کوردی لێ دەکەوێتەوە، لەبەر ئەوە چاکسازی‌و بنیادنانەوەی کەسایەتی مرۆڤی کورد، وەکو کاری پزیشکێك نییە کە تەنیا خۆی بەتاکەکەسەوە خەریك بکات، بەڵکو ئەو پرۆسەیە دەبێ لەرێگەی داڕشتنەوەی پلان و ستراتیژیەتێکی فراوان و دوورخایەنەوە، ئەنجام بدرێ. ئەمجا هەڵسو کەوت و هەوراز چوونی تواناو دەربڕینی تاکەکەسان، لەکارو تواناکانیاندا دەبێ بەسەنگی مەحەك بۆ ڕێك و پێکی‌و سەرکەوتنی ئەو پرۆسە چاکسازییە کۆمەڵایەتییە، چونکە داڕوخان و شێواندن پێویستی بەرۆنانەوەو چاکسازییە، هەرچەندە زووتر هەنگاوی جدیانەترو دڵسۆزانەتری بۆ بنرێ درەنگە.

*** دادوەری بەڕێز عەبدولباسیت فەرهادی لە وەڵامی پرسیاری: لە ڕۆژهەڵات بەگشتی زۆرجار زیندان دەبێتە هۆی داڕوخان و نائومێد کردنی زیندانییەکە. لەکاتێکدا زیندان بۆ دووبارە بنیادنانەوەی کەسی زیندانی کراوە. لەم بارەیەوەو چ ڕێگا چارەیەك بگرینەبەر بۆ رۆنانەوەی کەسایەتی مرۆڤی کورد گوتی:-**

لەبەر ئەوەی تا ڕاپەڕین مرۆڤی کورد زۆرجار لەسەر هیچ و خۆڕا دەگیراو زیندانی دەکراو لەوانەش بوو لەسێدارە درابووایە، تاوانەکەشی ئەوە بوو بەرامبەر ئەو کەسەی دەیگوت ئێمە فلان گەل یا میللەتین، کوردەکەش دەیگووت منیش کوردم، واتە: میللەتی تۆی داگیرکەر یا نۆکەری تۆ نیم. هەندێ جاریش لەسەر بێ دەنگی‌و پەسەند نەکردنی داوایە ناڕەوایەکەی داگیرکەران لە زیندان دەئاخندرا، بۆیە هەردەم مرۆڤی کورد بەچاوێکی پڕ لە رق و کینە سەیری جەلادان و زیندانی دەکرد، ڕۆژێك لە ڕۆژان زیندانی بە قوتابخانەو چاکسازیگاو جێگای دووبارە پەروەردە کردنەوە نەزانیووە، هەردەم بە شوێنی زوڵم و ستەم و شووم زانیووەو ئەوانەی لە دوڕ زیندان دابوون بەچاوی یوسفی بێ گوناح سەیر کراون، ئەو کەسەی بەزیندانی سزا دەدرا ورەی دەڕووخاو هەستی دەکرد لە قاوغی مرۆڤایەتی جێگەی نابێتەوە، ئەم بیرو بۆچوونەی خەڵك زیندانیان و تێڕاونینیان لەهەندێ لایەنەوە گۆڕاوە، بەگوێرەی خەڵکان و

هاوولاتیـان تـا رادەیـــەكی بـاش و هەسـتپێكراو دەبینـرێ كـە كەسـێ دەگـیرێو زینـدانـی دەكـرێ دەڵێن: ئەگەر كـارێكی خراپـی ئـەنجام نـەدابێ لـە خۆڕا ناگیرێو تێروانینیان بۆ دەزگاكانی گرتـن و بەندینخانەو كارمەندانی گۆڕاوەو دەزانن كە كوڕی ئەم میللەتەن هەرچەندە ئەگەر هەموو كەسیش وا هەست نەكەن، بەڵام ترس و تۆقین لـەناو هێنـانی دەزگاكـانی وەك پێش راپـەڕین نییـەو هاوولاتیـان بەهی خۆیـان دادەنێـن.. بـەڵام بەگوێرەی خـودی زیندانییەكـە، لەبـەر ئـەوەی كـە لـەماوەی زیندانـی هیچ بوارێـك و دەرفـەتێك نییـە رۆژانـە بـێ كـاریو تەمبـەڵی خـۆی پـێ بكـوژێو، بـەڵكو بەپێچەوانـە ئەگەر پێش زیندانـی كردنـی كـارێكی دەستی یـا جەستەیی ئـەنجام دابێ لە زینـدان بـەزۆری فـێری تەمبـەڵی دەكـرێو هـەوڵ نـادرێ فـێری كـارێكی سوودمەندو خێر بەخش ببـێ تـا بتوانـێ لـەدوای ماوەی زیندانییەكە سوودی لێ ببینـێ. بەواتایەكی تـر لەبـەر ئـەوەی بەرنامەیـەكی زانسـتانە نییـە بـۆ بنیادنانـەوەی زیندانیان و وەرشـەو جێگـاو كارگـە نییەو تا ئێستا زیندانێكی وامان نییە تایبەت بێ بە حوكمدراوان و مافیان بپارێزێو خـەریكیان بكا بـە ئیـش و كـارێك و لەلایـەكی تـر بـەڕێوەبردنی گرتووخانــەو بەندیخانــە لەدەســت دەزگاكـــانی پۆلیســـە، هەرچـــەندە پێویســـتە بـــەڕێوەبردنی بەندیخانــە بخرێتــە ئەســـتۆی بەڕێوەبەرایـــەتی چاكســـازی كۆمەلایـــەتی، چونكــە شـــارەزاترو كارامـــەترن لـــەبواری چاكســـازیو پســـپۆڕو شارەزایيان هەیە وەك توێژەرەوەی كۆمەلایـەتی، با گرتووخانەش بەڕێوەبردنی لە ئەستۆی دەزگاكانی پۆلیس بێ تا ئەوكاتەی گیراوەكـە حوكم دەدرێو هـەڵبدرێ زیندانـی تێبگەیـەندرێ كـە بـەهۆی ئـەنجامدانی تـاوانێك ئـەم سـزایەی بەسـەردا سـەپێندراوە، مەبەسـت لـە سـزاكەش چاكسـازی تۆمەت بارەكەو گێرانەوەیەتی بۆ ریـزی كۆمـەڵ و، لـەزیندان جۆرەهـا خـولی رۆشـنبیریو ئـایینیو نەتەوایەتیان بۆ بكرێتەوە تا ئەو كەسە هەست بكا، كە یەكێكە لە ئـەندامانی كۆمـەڵگای كـوردەواریو ئەو كەسانەی سزایان بەسەردا سەپاندووە دوژمنی ئەو نین و رقیان لێی نابێتـەوەو، هـەركاتێك مـاوەی زیندانییەكەش تەواو بێ رەفتاری رێك و پێك بكات هیچ جیاوازییـەكی نییـە لەگـەڵ ئـەندامانی تـری كۆمەڵ.

*** بێگومان كەسایەتی مرۆڤی كورد بە درێژایی مێژوو غەدری لێكراوەو شـێوێندراوە، بـۆ رۆنانـەوەی ئەم كەسایەتییە ئەركی دەزگاكانی راگـەیاندن چـی دەبێت یـاخود چـی بكرێـت؟! ئـەم پرسـیارەمان لـە رۆژنامەنووس و سەرنووسەری گۆڤاری روناهی كاك شێرزاد عەبدولرەحمان كرد ئەویش لـە وەلامـدا وتـی:-**

یەك لە فاكتەرە بەهاكانی پێكەوەنانی كۆمەڵگەی نوێو بنیادكردنەوەی سەر لە نوێی ژیان، خەباتە بۆ دروستبوونی كەسایەتی مرۆڤ و دامالینی لە پاشماوەی برینداری مێژوو كە كەسایەتی مرۆڤیان خستۆتە ئەو حالەتەی مەترسی لە بوون و ماهیەتی خـۆی بكـات و پاشـەڕۆژی بخرێتـە مەترسـییەوە. كـارێكی لەپێشـینەی راگـەیاندن هەوڵدانــە بـۆ دروســـتكردنەوەی یـــان روح بەبەرهێنانـــەوەی كەسـایەتی مرۆڤـی ئـەم سـەردەمە جەنجاڵـە كـە گیرۆدەیـە بـە ئـاڵۆزیو كێشـەی گـەورە، پـەیامی راگـەیاندن بـەوە ناوەسـتێت كـە رووداوەكـان تۆماركات، بەوە ناوەستێت كە ببێتە سەرچاوەی





هەواڵە ساردو سڕەکان، بەوە ناوەستێت کە لاپەڕەکانی خۆی والآکات بۆ حەزی بەرپرسان، بەڵکو راگەیاندن لەسەریەتی پرسیارە بزرەکان وەڵامداتەوە، لەو جوغزە تەقلیدییە دەرچێت کە قاڵبی پێگرتوون، بەڵکو ئەوەیە گوزارشت بکات کە چۆن پشکداری لە دروستبوونی راستەقینەی کەسی کورددا دەکات؟ بەهەقیقەت تاکی کورد قوربانییە، قوربانییە بۆ ئەو ئاسەوارەی کە دەرهەق بە کۆمەڵگەی کورد کراوە، لەسەر راگەیاندنە کە بەرنامە دارێژێ بۆ بنیادکردنەوە. بەدیدی من، ئەم پرۆسە کارێکی سانا نییە، چونکە ماوەیەکی کەم نییە ئینسانی کورد لەژێر باڵی ئازاری سیاسیدا دەناڵێت، رووبەرووی پێشێلی کاری بۆتەوە، بۆیە کاری راگەیاندن قورسە لەو هەل و مەرجەدا، بگرە پرۆسەیەکی حەساسە، لەو سۆنگەوە راگەیاندن بەهەموو بەشەکانییەوە، دەبێ بەشداری لەبنیادنانی ژیان بکات و ئینسانی کورد لە بێ (ئومێدی) رزگار کات، دەبێ ئەم بۆچوونە چۆن تەرجەمە بکرێو رەنگدانەوەی چی بێ؟ کە دەڵێین: (بینا) واتە: رزگار بوونی لەهەموو دیاردە دزێوەکان رزگاربوونی لەو ئاڵۆزییە گرفتارەی زاخاوی داوە. کەبمانەوێ کەسایەتی تاکی کورد بگۆڕین، دەبێ لەوە حاڵی بین کە راگەیاندن خۆی لە (چەواشەکاری) رزگار کا. موسایەرەی واقیع بکات، بڕوا بەخۆ بوون لە زهنی کورد دروست کات، رۆڵی هەقیقەت بگێڕێ لە درکاندنی هەقیقەت، بەلآم لەو دەوروبەرە بەرپرسیارییەی خۆی پشکداری لەگۆڕانکارییەکانی سەردەم بکات، هەموو گەوانەش بە (عەقلی نوێ) دێتەدی کە بخزێتە ناو دونیای راگەیاندن، بزانین خۆزگە گەورەکانی کەسایەتی کورد لە چیدا بەرجەستەیە؟ لە دەروونی مرۆڤی کورد چی دەخولێتەوە؟ ئینجا دەوری ئێمە تەنیا (وروژاندن) نییە، بەڵکو دەرخستنی رووی راستی مەسەلەکانە، ناکرێ لەهەموو حاڵەتێك ئەوەمان لەبیر بچێت کە (کەسایەتی برینداری کورد) لەریتمی ئەو سەردەمە نزیك کەینەوە، ئەقل و ویژدانی مرۆڤی ئەم سەردەمە بەوە رابێنین کە پێویستە لەگەڵ ژیان نوێ بینەوە، ئینتمای نیشتمانیو قوربانیدان لە رۆحی مرۆڤدا بچێنین، لەجیاتی رەشبینیو پاشگەزبوونەوە، هەوڵبدرێ ئەو ئینتمایە بە کردەوە رەگ و ریشەی داچێنێ، قەناعەت بە نەوەی ئەمرۆ بێنین کە ئینتما قسەی سواو نییە، بەڵکو وازهێنانە لە دروشم و تێکەڵاو بوونە بە واقیع و خۆ دوورخستنەوە لە هەر دەنگێکی نووساو کە ئەم تەجرەبەیە دەخاتە گومانەوە، فەراهەم کردنی ئەو دەستەواژەی کە رۆحێکی نوێ بەبەر ژیاندا دەکا، کە ژیان لە تەکان و نوێ بوونەوەدا بێت، بۆچی راگەیاندن نەتوانێت وەڵامی پرسیارەکان بداتەوە؟

مادام بڕوامان بە تەکان هەیە بۆ خۆمان بۆ ئەو سەردەمە ئامادە نەکەین کە واز لە تەقلیدییەت و وەستان لە چوارچێوەیەکی تەسك بێنین و بەفیعلی پشکداری لە دروست بوونەوەی ژیان و کەسی کورد نەکەین کە ئەمرۆ چاوی لە راگەیاندنە. بە هەموو ئازارو خەونەکانییەوە خۆی تێدا ببینێ.

*** لە دونیای ئەدەبیش دکتۆر ئیبراهیم قادر مامۆستاو بڕیاردەری بەشی کوردی کۆلیژی ئاداب، کە ماستەرنامەو دکتۆراکەی لەبارەی چیرۆکی کوردییە. ئەو پرسیارەمان لێ کرد. چیرۆکنووس و رۆماننووس رێك پاڵەوانەکەی (کەسایەتی) لەواقیعەوە ناگوازێتەوە نێو دەق، بەڵکو تێکەڵ بە خەیاڵ و بەشێکی دروستکراوی خۆیەتی جا بەم کارەی چەندە توانیویەتی خزمەتێك**




**بەواقیعی کەسایەتی شێوێندراوی کورد بکات. بەوەی دوژمنانی کورد بە درێژایی چەندین سەدە هەوڵی شێواندن و لەباربردنی کەسایەتی مرۆڤی کوردیان داوە. دکتۆر لە وەڵامدا وتی:-**

کارەکتەران (کەسان)ی ناو چیرۆك و رۆمان دەشێت راستەقینە بن هەر وەکو لە رووداوە راستەقینەکانی مێژوودا روودەدات و کەسان لە رۆمانی مێژووییدا راستەقینەن و رووداوی دروستکراوی خەیاڵیان دەدرێتە پاڵ، چونکە هونەری گێڕانەوە وا دەخوازێت تاکو لە مێژوو جوویی بکاتەوە! بەڵام لە چیرۆك و رۆمانی زادەی بیرو خەیاڵی داهێنەرانی چیرۆکنووس و رۆمانووسدا مەرج نییە کەسان بە راستەقینە هەبن یان بووبن !! ئەوەندە هەیە ئەو کەسانەی لە چیرۆك و رۆماندا دەکرێنە کارەکتەرو زۆر جاریش رۆڵی پاڵەوانیەتی بێ وێنەو درەوشاوەیان دەدرێتێ ئەوەندە واقیعین کە وەك مرۆڤ هەن و لەناو کۆمەڵگەی مرۆڤدا نمونەیان (تایپ) هەیەو دەژیت. مەرجیش نییە هەموو هەڵس و کەوت و کردارێکیان رووی دابێت. تەنیا ئەوەندە هەیە لەو رووەوە کە ئەرستۆ گرتوویە لەبەر رۆشاییو پێویستیو شیان (الضرورة والاحتمال)دا بێنەدی.

ئەو پرسیارەی کە چاوەڕوانی وەڵامە ئەمەیە: ئایا ئەو کەسانەی ناو چیرۆك چەندیان راستەقینەن و؟ چەندیان لەنووسەرەوە خراوەتە سەریان، یاخود کەسێتی نووسەریان تیادا رەنگ دەداتەوەو؟ چۆنیەتی دروست بوونیان؟.

لە وەڵامدا (کەشتێکی تازە ناگوترێت) دەڵێم: هەروەکو (ئیلاهەی بەهەشتی) نووسەری ئێرانی لە (عوامل داستان)داو پێش ئەویش کەسانی دیکە گوتویانە کە: کارەکتەری ناو چیرۆك و رۆمان وەکو دێوجامەیە (ئەو پارچە قوماشەی لە پارچەی گچکە گچکەی قوماشی رەنگاو رەنگ دروست دەکرێت بۆ راوە کەو) کە سەدان رەنگە، وایەو زۆرجار رەنگدانەوەی کەسێتی نووسەریش تیادا دەبیندرێتەوە.. ئەو کەسانەی لە چیرۆکدا هەن مەرج نییە هەر راستەقینە بن، بەڵام لە واقیعدا لە وێنەی ئەوان و رەفتاریان زۆر هەن.. تەنیا ئەو کەسانە یان کارەکتەرانە نەبن، کە فەنتازین و نووسەر بە مەبەستی تایبەت دروستیان دەکات.

لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا کە ئایا کەساتی ناوچیرۆك و رۆمان تا چ رادەیەك توانیویەتی کەسایەتی تاکی کورد دەربخات؟ دەڵێم: کە نووسەرانی کورد لە رۆمانەکانی تا کۆتایی هەشتاکان (ژانی گەل، کوێخا سێوێ، هەڵکشان بەرەو لوتکەو پێشمەرگە ) کەسێتی کوردیان زۆر سەرکەوتوانە پێشانداوە.. هەروەها لە چیرۆکی هەفتاکاندا (کورتە چیرۆك) دیسانەوە کەسێتی کوردو تاکی کورد سەرکەوتوانەو بەهێز پیشاندراوە.

ئەوەندەی پرسیارەکە دەیگرێتەوە، دوژمنانی کورد چۆن ئەو کەسانەیان لەناوچیرۆکدا بەکارهێناوەو دەرخستووە؟ بێگومان دوژمن بەهەر زمانێك نووسیبێتی کوردی بە خواستی خۆی پێشانداوە، ئەمەش زۆر ئاساییەو، دەبێت لە دوژمن چی چاوەڕوان بکرێت لە ئەدەبیاتی ئەودا چاوی بۆ بگێڕدرێت، بەلای ئەوانەی خۆفرۆش و دژە کوردن و بۆ دوژمن دەنووسن کەتاکی کورد بە کەسێتیەکی لاوازو رووخاو پێشان بدەن وەکو خۆیان و سەرەکانیان دەیانەوێت.

بۆیە پێویستە ئێمە سەیری دەم و قەڵەمی دوژمنانی کورد نەکەین بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە




بەبەڵگە نووسەرانی کورد (نووسەری دڵسۆزو نەتەوە دۆست)و بەرهەمەکانیان بکەین بە سەنگی مەحەك بۆ ئەم هەڵسەنگاندنە.

*** لە وەڵامی پرسیاری (ئایا ئابووری چەند کاریگەری بەسەر دروستبوونی کەسایەتییەکی سەرکەوتووەوە هەیە؟) مامۆستاه ڤوتابی دکتۆرا یاسین رەسول لە بەشی ئابووری زانکۆی سەلاحەددین و بەم جۆە ئاخافت:**

هۆکاری ئابووری بەیەکێك لە هۆکارە گرنگەکانی ژینگەیی دادەنرێت بۆ دروستکردنی کەسایەتی مرۆڤ، چونکە هەر مرۆڤێك ژمارەیەکی لە ژمارنەهاتووی پێداویستی جۆراوجۆری هەیە: (خواردن و خواردنەوە، جل و بەرگ، شوێنی حەوانەوە، هۆکاری گواستنەوە، خوێندن و چارەسەرکردن لە نەخۆشی هتد) کە رۆژ لە دوای رۆژ روویان لە زیادبوونە بە زیاتر پێشکەوتنی مرۆڤ و، ئەم پێداویستیانە توانای تێربوونیان (اشباع) هەیەو ئەگەری دووبارە بوونەوەو نوێ بوونەوەیان هەیە، جگە لە چەندین خەسلەتی دیکە.

جا تێرکردنی ئەم پێداویستیانە بەندە لەسەر چەندی دەرامەتەکانی رەخساوە بۆ مرۆڤ کە بەدەگمەن ناسراوە بەبەراورد کردن لەگەڵ ژمارەی پێداویستییەکان. بۆیە سەرهەڵدانی زانستی ئابووری بۆ کەمکردنەوەی گرفتەکانی مرۆڤ و هەوڵدان بۆ چۆنییەتی بەکارهێنانی ئەم دەرامەتە دەگمەنانە بۆ تێرکردنی پێداویستییە لە ژمار نەهاتووەکانی مرۆڤ بەباشترین بەکارهێنان بۆ گەیشتنی مرۆڤ بەبەرزترین سوودو بەدەستهێنانی ئاستێکی بەرزو گونجاو لە کامەرانیو ئاسوودەییو خۆش گوزەرانی هاتۆتە پێشەوە. جا دروستکردنی کەسایەتییەکی (زیرەك، ئاست بەرزی زانستی، کارامە، بەهرەمەند، هوشیارو خاوەن تەندروستییەکی ساغ.. هتد) بەندە بەچەند تێرکردنی مرۆڤ بۆ ئەم پێداویستیانەو چەند هەبوونی دابین بوونی ژمارەی (دایەنگەو قوتابخانەو زانکۆو باچچەی گشتیو نەخۆشخانەو تۆرەکانی رێگەوبان و پرۆژەکانی ئاوو ئاوەرۆکان و تەزووی کارەباو پرۆژە پیشەسازییەکان و هەموو لایەنەکانی تری ژێرخانی ئابووری لە وڵات.

هەروەها ئاستی ئەم لایەنە جیاوازانەو دابین بوونیان بەندە بەئاستی ئابووریو داهاتی نەتەوەییو ئاستی بەرهەم هێنان و رێژەی داهاتی تاکەکەس لەو وڵاتە.

بۆیە ئەگەر سەنج بدەین ئاستی جیاوازی لە کەسایەتی مرۆڤ لەنێوان وڵاتە پیشەسازییە پێشکەوتووەکان کە لەچ ئاستێکی بەرزدایەو بەپێچەوانەش لە وڵاتانی جیهانی سێیەم، کەچۆن رۆژانە هەزاران کەس بەبرسێتیو نەخۆشی ئاستی نزمی دەرامەت و ئابووری دووچاری مردن دەبنەوە.

لێرەوە دەبینین کەوا ئایینی پیرۆزی ئیسلام لەپێناو (بەرجەستەکردنی کەسایەتییەکی ئازادو پایە بەرزو دابین کردنی دادپەروەریو یەکسانیو کەمکردنەوەی جیاوازی نێوان چینەکانی کۆمەڵگاو گەیاندنی بۆ لوتکەی بەختەوەری مرۆڤایەتیدا) بەچەندین دەقی ئایەتی قورئان و فەرموودەکانی پێشەوای مرۆڤایەتی محەممەد(د.خ) ئاماژە بە چەندین لایەنی جیاوازی ئابووری دەکات و بۆ پێرەو کردنیان هانمان دەدات:

١. رێگەدانی مرۆڤ سەرەڕای مافی موڵکداری تایبەت بەمافی موڵکداری دەوڵەت و موڵکداری گشتی ﴿لِلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِمَّا اكْتَسَبُوا وَلِلنِّسَاءِ




نَصيبٌ مِمَّـا اكْتَسَبْنَ/ النساء-٣٢﴾، (من قتل دون ماله فهو شهيد)نسائى ريوايـەتى كـردووە، ﴿هُـوَ الَّـذِي خَلَـقَ لَكُـمْ مَـا فِـي الأَرْضِ جمِيعًـا/ البقـرة-٢٩﴾،(النـاس شـركاء في ثـلاث الكـلاء والمـاء والنار)ئەبو داود ريوايەتى كردووە.

٢. ريْزگرتـن لـە كـارو كـاركردن و دانـانى بەپلەيەكى بەرزو پيرۆز و بەشيْك لەخواناسى ﴿وَأَنْ لَيْـسَ لِلإِنسَـانِ إِلاَّ مَـا سَعَى/ النجم-٣٩﴾، ﴿فَـإِذَا قُضِيَتْ الصَّلاَةُ فَانتَشِـرُوا فِـي الأَرْضِ وَابْتَغُـوا مِـنْ فَضْلِ اللَّهِ/ الجمعة-١٠﴾، (ما اكل احد طعاماً قط خيراً من ان ياكل من عمل يديه وأن نبي الله داود علية سـلام كـان يـأكل مـن عمـل يـده)بوخـارى ريوايەتى كردووە.

٣. قەدەغـەكردن و حـەرام كردنـى (ريبـا)و دانانى بەيەكيْك لە گوناهە گەورەكان ﴿وَأَحَـلَّ اللَّـهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا/ البقرة-٢٧٥﴾.

٤. خۆدوورخسـتنەوە لـە قۆرخكردنـى (احتكـار) هـەموو جـۆرە شمـەكيْك و بەتايبـەتى ئەوانەى كە زەروورين (لايحتكر الا الخاطئ)موسلم ريوايەتى كردووە.

٥. خۆ دوورخستنەوە لە فيْـل و سـاختەو لـە كريـن و فرۆشـتن لـە كيْشـان و پيْوانـدا. ﴿وَيْـلٌ لِلْمُطَفِّفِـينَ* الَّذِيـنَ إِذَا اكْتَـالُوا عَلَـى النَّـاسِ يَسْـتَوْفُونَ* وَإِذَا كَـالُوهُمْ أَوْ وَزَنُوهُـمْ يُخْسِـرُونَ/ المطففين-١-٢-٣﴾، (من غشى امـتي ليس مـني) ئەبوهورەيرە ريوايەتى كردووە.

٦. فـەرز كردنـى زەكـات و بەخشـينى خـيْرو صـەدەقەو چاكـە كـردن ﴿لَيْـسَ الْـبِرَّ أَنْ تُوَلُّـوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَـنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِـرِ وَالْمَلاَئِكَـةِ وَالْكِتَـابِ وَالنَّبِيِّـينَ وَآتَـى الْمَـالَ عَلَـى حُبِّـهِ ذَوِي الْقُرْبَـى وَالْيَتَـامَى وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّـائِلِينَ وَفِـي الرِّقَـابِ وَأَقَـامَ الصَّلاَةَ وَآتَى الزَّكَـاةَ وَالْمُوفُـونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُوا وَالصَّـابِرِينَ فِـي الْبَأْسَـاءِ وَالضَّـرَّاءِ وَحِـينَ الْبَأْسِ أُوْلَئِكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَأُوْلَئِكَ هُمْ الْمُتَّقُـونَ/ البقرة-١٧٧﴾، ﴿وَآتُوهُـمْ مِـنْ مَـالِ اللَّـهِ الَّـذِي آتَـاكُمْ/ النور-٣٣﴾.

ويْـراى ئـەم خالانـەش چـەندين لايـەنى گرنگـى ديكەش هەن كە ليْرە جيْگاى نابيْتەوە، بەلام ئيْمەى كـورد لـە كوردسـتانى ئـازاد پيْويسـتە لەسـەرمان، كـەوا دووبـارە چـاو بەلايەنـە ئابوورييـەكان بخشيْنينەوەو بەباشترين شيْوە ريْكيان بخـەين تـا بتوانين كەسايەتى كوردى رەسەن بپاريْزين و زياتر هوشيارو بەختـەوەرى بكـەين. بـۆ ئـەم مەبەسـتە پيْويستە:

بايەخ بە هەموو كەرتە ئابوورييەكان و بەتايبەتى كـەرتى كشـتوكال و پيشەسـازىو گەشـتوگوزار بدەيـن، كـە لـەو سـالانەى دواى راپـەرين تووشـى زيـانيْكى زۆر بوونەتـەوەو رۆلـى گرنگـى خۆيـان نابينن بۆ ئەوەى بين بەسەرچاوەى گرنگى داهات و كەمتر پشت ببەستن بەسەرچاوەى سەرەكى ئيْستا كە باجى گومرگەكانە كە زياتر لە ٨٠٪ بودجـەى هەريْمى كوردستان پيْك ديْنيْت.

هـەروەها زياتر سوود وەرگرتن لە بريارى ٩٨٦ لەپيْناو دووبارە بنيادنانەوەى ژيْرخـانى ئـابوورى كوردسـتان و دابين كردنىهۆكـارى بـەختيارى بـۆ ميللـەت و هـاندانى گـەنج و لاوەكانمـان بـۆ جيْگيربوون و وازهيْنان لە كۆچ كردن بۆ هەندەران و.. هتد.





# ٨ی ئازار
# هێمای یەکسانیو جەژنی ئافرەتانە

پەروین وەلی

هەموو ساڵێك ئافرەتانی جیهان لەم رۆژە پیرۆزەدا یادی بوون و قەوارەی خۆیان دەکەنەوە کە ساڵ بە ساڵ ئەم یادەوەرییە گرو تینێکی تر بە خەباتی ئافرەتانی جیهان دەدات بۆ دەستەبەر کردن و مسۆگەر کردنی هەموو مافەکانیان کە بەداخەوە هێشتا لەچەندین ناوچەی جیهاندا پێشێل دەکرێت. ئافرەتانی کوردستانیش دوای ئەوەی بەشێك بوون لە راپەرینە مەزنەکەی بەهاری ١٩٩١ی گەلەکەمان و پێشتریش قوربانیو سووتەمەنی شۆڕشە یەك لەدوایەکەکانی گەلی کوردو ئەنفالە بەد ناوەکان بوون. ئێستا لە سایەی پەرلەمان و حکومەتی هەرێمی کوردستان و ئازادی هەرێمەکەماندا بەشێکی کاریگەرن لە کۆمەڵگای کوردەواری و لە پەرلەمان و حکومەتی هەرێمی کوردستان رۆڵی کاریگەر دەگێرن. لەکاتێکدا ئەم یادە دەکەینەوە سکرتێری یەکێتی ئافرەتانی کوردستان خاتوو شیرین ئامێدی لە وڵاتی (سوید)ەوە لەلایەن گەورە بەرپرسانی ئەو وڵاتەو ئافرەتانی سویدەوە پێشوازی گەرمی لێدەکرێت، سەبارەت بە ئافرەت لە سایەی ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا دەڵێین کە ئافرەت لە ئیسلامدا بوونەوەرێکی پیرۆزو گرنگە هەموو مافەکانی بۆ فەراهەم کراوە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی پێغەمبەری مەزن ئەم راستییە دووپات دەکەنەوە، بەم بۆنەیەوە ئێمەی فەرمانبەرە ئافرەتەکانی وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی پیرۆزبایی لە خۆمان و هەموو ئافرەتانی کوردستان و جیهان دەکەین و هیوادارین ئەم بیرەوەرییە ببێتە مایەی بەدیهێنانی هەموو مافەکانی ئافرەت لە سەرتاسەری جیهاندا و ئافرەتانی کوردستانیش لە سایەی پەرلەمان و حکومەتی هەرێمی کوردستاندا ببنە سومبوڵی بەرخودان و پێشکەوتنی کۆمەڵگای کوردەواری.




# چالاکییەکانی وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی

ئا/ دژوار حەسەن

## بەڕێز وەزیری ئەوقاف پیرۆزبایی لە برا مەسیحییەکان دەکات

* بۆ پیرۆزبایی کردن لە جەژنی قیامەی برا مەسیحییەکان بەڕێز شێخ عەدنان نەقشبەندی وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی بە یاوەری سەرجەم بەڕێوەبەرەکانی وەزارەت سەردانی شارۆچکەی عینکاوەی کردو سەرەتا ئەسقەفیەی کلدانییەکانی بەسەرکردەوەو پیرۆزبایی لە مەتران یەعقوب شێر سەرۆکی ئەسقەفییەی کلدانییەکان کرد، پاشان بارەگای بزووتنەوەی دیموکراسی ئاشووری بەسەرکردەوەو پیرۆزبایی گەرمی لە بەڕێز (یونادم یوسف کنا) سکرتێری بزوتنەوەو سەرجەم ئەندامانی سەرکردایەتی بزوتنەوەی دیموکراسی ئاشووری کرد. ئینجا بەڕێزیان سەردانی حزبی (بیت نهرین)ی کردو لەلایەن بەڕێز زادوق ئادەم پێشوازی گەرمی لێکرا، لەهەموو ئەم بەسەرکردنەوانەشدا سەرەڕای پیرۆزی جەژنی قیامە لەبرا مەسیحییەکان، وەزیری ئەوقاف جەختی لە برایەتی و پێکەوە ژیانی ئایینی لە هەرێمی کوردستاندا کردەوەو هیوای خواست لە سایەی ئاشتیو بەرقەرار بوونی یاسادا ئەم برایەتییە پتەوتر بکرێت.

## بەڕێز وەزیری ئەوقاف سەرپەرشتی کۆبوونەوەیەکی پەیمانگاو قوتابخانە ئیسلامیەکان دەکات

* بە مەبەستی پێداچوونەوە و چاوخشاندنەوە بە سیستەمی خوێندن لە پەیمانگا و قوتابخانەکانی ئیسلامی لە هەرێمی کوردستاندا یەک شەممە ٢٠٠٢/٥/١٢ بەڕێز شێخ عەدنان نەقشبەندی وەزیری ئەوقاف وکاروباری ئیسلامی لەهۆڵی کۆبوونەوەکانی وەزارەت سەرپەرشتی کۆبوونەوەیەکی کرد لەگەڵ سەرجەم بەڕێوەبەرو مامۆستایانی ئایینی پەیمانگاو قوتابخانەکانی ئیسلامی لە هەرێمی کوردستاندا. لە کۆبوونەوەکەدا کە بەڕێزان خورشید شێرە بریکاری وەزارەت و مامۆستا مەلا محەممەد ئاکرەیی سەرۆکی یەکێتی زانایانی ئایینی ئیسلامی کوردستان و بەڕێوەبەری گشتی دیوانی

وەزارەتی ئەوقاف ئامادە بوون. باس لە رەوشی خوێندن و پرۆسەی بەرێوەچوونی تاقیکردنەوەکانی قوتابخانەکانی ئیسلامی کرا. وەزیری ئەوقاف تیشکی خستە سەر زەرووڕەتی بەستنی کۆنفرانسێکی زانستی بۆ چاکسازی و رێکخستنەوەی پرۆگرام و مەنهەجی سەرجەم قوتابخانەکانی ئیسلامی لە هەرێمی کوردستاندا بە جۆرێک لەگەڵ رەوشی ئایینی و ئەزموونی ئازادی و دیموکراسی هەرێمی کوردستان گونجاو بێت و لە ئاستی پێشهاتە زانستی و مەنهەجییەکانی دوای رووداوەکانی (( ١١ی سێپتێمبەر)) دا بێت. پاشان هەریەک لە بەشداربووانی کۆبوونەوەکە چەندین پێشنیار و بۆچوونی نوێی بۆ باشکردنی رەوشی خوێندن و زانستی ئیسلامی لە قوتابخانەکانی هەرێمی کوردستاندا پێشکەش کرد و هەمووان جەختیان لەسەر ئەوە کردەوە کە پێویستە قوتابخانە و پەیمانگاکانی سەر بە وەزارەتی ئەوقاف هاوشانی پرۆسەی زانستی و بەرەوپێشبردنی کێشەی رەوای گەلی کورد بن لە هەرێمی کوردستاندا.

## سەردانی بەڕێز وەزیری ئەوقاف بۆ شەقلاوەو گوندەکانی دەوروبەری



* لە رۆژی ٢٠٠٢/٥/٣٠ بەڕێز شێخ عەدنان نەقشبەندی وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی بە یاوەری ژمارەیەک لە بەرێوەبەرانی دیوانی وەزارەت و قائمقامیەتی قەزای شەقلاوە و بەرێوەبەری ناحیەی هیران سەردانی مزگەوتەکانی گوندەکانی نێوان هیران شەقلاوەیان کرد و دواتر سەردانی تەکیەی ناحیەی هیرانی کرد و لەوێ لە لایەن ژمارەیەک لە مامۆستایانی ئایینی و جەماوەری ناوچەکە پێشوازی گەرمی لێکراو بەڕێزی لە کەم و کوڕی تەکیەکەی کۆڵییەوە و بریاری دا چی پێویستە بۆی جێبەجێ بکرێت و رێنمایی مامۆستایانی ئایینی بەڕێزی کرد، کە هەردەم لە خزمەتی مزگەوت و شوێنە ئایینییەکاندا بن و رۆلی وەزارەتیشی لەم لایەنەوەوە دووپات کردەوە. دواتر بەڕێزی بە ئامادە بوونی ژمارەیەکی بەرچاوی خەڵکی ناوچەکە و مامۆستایانی ئایینی پرۆژەی (منارە)ی مزگەوتی (آل میران)ی لە قەزای شەقلاوە کردەوە، کە لە لایەن وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی بە بڕی (٢٧٠٠٨٠) دینار بە





شـــێوازێکی شارســـــتانیانه دروست کراوه .

## دڵنیا بوون له ڕەوشی تاقیکردنەوەکانی سەری ساڵ

* بەمەبەستی ئاگاداربوون لـه ئەزموونـەکانی سـەری سـاڵ و شێوازی بەڕێوەچوونی لـه ڕۆژی ٢٠٠٢/٦/٨ بـــەڕێز وەزیـــری ئـەوقاف و کاروبـاری ئیسـلامی سـەردانی هـۆڵی تاقیکردنـەوەی قوتابیانی خوێندنی ئیسلامی لـه مزگەوتی سەوافی شاری هەولێر کـرد، بـۆ ئـەوەی لـە نزیکـەوە ئاگـــاداری بـــەڕێوەچوونی تاقیکردنـەوەکان بێـت شـایانی باسه لەم سەردانەیدا بەڕێوەبەری قوتابخانـــەکانی ئایینییـــەکان یاوەری بەڕێزی بوون.

## بەڕێز وەزیری ئەوقـاف پێشوازی لەوەفدێکی کۆماری ئیسلامی ئێران دەکات

* لـــه ڕۆژی دووشـــــەممه ٢٠٠٢/٦/١٠ بەڕێز شێخ عـەدنان نەقشـبەندی وەزیـری ئـەوقاف و کاروبـاری ئیسـلامی لـه دیوانـی وەزارەت پێشـوازی لـه شـاندێکی کۆماری ئیسلامی ئێران کـرد. لـه دیدارێکدا، کە بـەڕێزان خورشید شـــێرە بریکـــاری وەزارەت و بەڕێوەبـەری حـەج و ئیرشـادی دینـی لـه وەزارەتـی ئـەوقاف ئامادە بوون باس لە ئاسانکاری کۆماری ئیسلامی ئێران بۆ ئـەو حاجیانـەی کـه دەیانـەوێت لـه ڕێگای کۆماری ئیسلامی ئێران سەفەری حەج بکەن کرا. وەزیری ئەوقاف داوای لە شاندی میوان کـرد کەلـه سـەفەری حـەجی داهاتوودا ئەو کۆسپ و تەگەرانه هـەڵبگیرێت کـە پێشـتر دەهاتـه بـەردەم سـەفەری حاجییـەکانی کوردسـتان، شـاندی میوانیـش بـەڵێنی ئـەوەیاندا کـه لـه ساڵی ئاییندەدا هـەموو ئاسانکارییەك بـۆ حاجییـەکانی کوردسـتان ئـێراندا شـاندی حاجییـەکانی کوردسـتان بـەرەو عەرەبسـتانی سـعودیه بـەڕێ دەکـەوێت. لـه بەشێکیتری دیدارەکەدا وەزیری ئـــەوقاف ئامـــاژەی بــــه پێشـــوەچوونی هەمەلایەنـــەی پەیوەندییـــەکانی کۆمـــاری ئیســـلامی ئـــێران و هـــەرێمی کوردستان کرد و هیوای خواست ڕۆژ لـــــه دوای ڕۆژ ئـــــەو پەیوەندییانه زیاتر پێش بکەون. شایانی باسه ساڵانه وەزارەتـی ئـەوقاف و کاروبـاری ئیسـلامی ژمارەیـــەك لـــه حاجییـــەکانی کوردستان لـه ڕێگـای کۆمـاری ئیســـلامی ئێرانـــەوە بـــەرەو



دەکرێـــت و بـــه شـــێوەیەکی شایسـته و بـه هەماهـەنگی لـه نێـــوان حکومـــەتی هـــەرێمی کوردسـتان و کۆمـاری ئیسـلامی عەرەبستانی سعودیه و کەعبەی پیرۆز ڕەوانه دەکات.







# لەدادگای تەمییزی هەرێمی کوردستانەوە

ئا/ مافپەروەر: سیروان ئەحمەد

زنجیرە بڕیارێکی دادگای تەمییزی هەرێمی کوردستانە، گۆڤارەکەمان لە هەموو ژمارەیەکیدا دوان لەو بڕیارانە وەردەگێڕێتە سەر زمانی کوردی کە پەیوەستن بەئەوقاف و مەسەلە شەرعییەکانەوە، ئەم کارەش هەنگاوێکی بەراییانەیە لەرێگەی بەکوردی کردنی یاسا.

١- دەستەی باری کەسی لە دادگای تەمیزی هەرێمی کوردستانی عێراق لە رێکەوتی ١٥ موحەرەم/١٤٢١ك بەرامبەر رۆژی ٢٠٠٠/٤/١٩ز بە سەرۆکایەتی دادوەری (الاقدم) بەڕێز (جەلال زێوەر عومەر) و ئەندامیەتی هەردوو دادوەر بەڕێزان (نازم محەممەد ئەمین جەمیل حەویزیو سەلاح ئەحمەد یەعقوب) پێکهات، کە رێپێدراون بەناوی گەلەوە دادوەری بکەن، ئەم بڕیارەیان دەرکرد:

تەمیزکار: داوالێکراو/خ

تەمیز لەسەر کراو: داواکراو/ ك

پارێزەری بەڕێز (ب) لە بریکاری داواکار بانگەشەی ئەوەی کرد کە داوالێکراو خوشکی ژنی بریکاردەرەکەیەتی و (قیم)ە لەسەری بەپێی بەڵگەنامەی (قیمومة) کە لەهەمان دادگا دەرچووە لەژێر ژمارە ٩٩٩/٧ لە ١٩٩٩/٨/٤، مێردی بریکار دەرەکەشی لە رێکەوتی ١٩٨١/٥/١ بزربووە،





هەواڵێکی راستیش دەرنەکەوتووە سەبارەت بە مان و نەمانی. بۆیە داوای کرد داوا لێکراو بانگ بکرێت بۆ دادبینیی و حوکم بدرێت بە مردنی مێردی بریکاردەرەکەی و خەرجییەکانیشی بکەوێتە ئەستۆ، لە ئەنجامی دادبینیەکە دادگای باری کەسی لە دهۆک حوکمێکی بە ئامادەبوونی هەردوولا دەرکرد لە رێکەوتی ٨/٤/٢٠٠٠ کە قەزاوەت دەکات بە مردنی بزربوو (ح) لە رێکەوتی دەرچوونی حوکمەکەوەو داوالێکراویش رەسم و خەرجییەکانی بکەوێتە ئەستۆ بە ماندوێتی پارێزەرایەتیشەوە کە سەد دینارە بۆ بریکاری داواکار. لەبەر ئەوەی داوالێکراو قەناعەتی بە حوکمەکە نەهات لە رێی تەمیزەوە تانەی لێدا بەلائیحەکەی لە رێکەوتی ١٣/٤/٢٠٠٠، دوای گەیشتنی فایلی داواکە خرایە ژێر باس و لێکۆڵینەوە:

**بڕیار:**

دوا بەدوای وردکاریو لێکۆڵینەوە دەرکەوت کەتانە تەمیزیەکە لەماوەی یاسایدایە، بۆیە لە رووی شێوازەوە قبوڵ کرا. دوای تێروانینەوە دەرکەوت کە حوکمە تەمیزکراوەکە راست نییەو پێچەوانەی حوکمی شەرع و یاسایە، چونکە داوالێکراو ناکرێت رکابەر بێت لەم داوایەو حوکمی م٤ (مرافعات)ی لێناکەوێتەوە، رکابەرەکەش مێردی داواکارە واتە خودی بزربووەکەیە، چونکە سەڵاحیەتی (قیم) لە سەڵاحیەتی (وصي) تێناپەڕێت (م٨٩ لە یاسای چاودێری ناکامەکان) سەڵاحیەتی (وصي)ش لەبەشی دووەمی یاسای چاودێری ناکامەکاندا دیاریکراوە کەدابڕە لە کاروباری کارگێری بەو سنورەی لە یاساکەدا روونکراوەتەوە، ئەرکەکەش کۆتایی دێت بە بزربوونی یان بە چەسپینی دیارنەمانی، سەرەڕای ئەمە لە حاڵەتی هەبوونی رکابەریدا پێویستە رابگەیەنرێت یان بڕیارێکی راست لەلایەن پەیوەندیدارەوە لەو بارەیەوە بەدیار بخرێت و ناکرێت پشت ببەسترێت بە کتێب و پەیوەندی کردنی ئاساییەوە (مادە ٨٧ لە یاسای چاودێری ناکامەکان)و دڵنیابوونیش لەبوونی یەکێك لەو حاڵەتانەی کە لە مادە ٩٣ی یاسای ناوبراودا هاتووە، هەروەها لەسەر دادگایە بەدوای بزربوودا بگەڕێت بەهەموو رێگەیەك م٩٤ی هەمان یاسا. لەبەر ئەوە بڕیاردرا حوکمە تەمیزکراوەکە هەڵبوەشێنرێتەوەو مەلەفی داواکارەکەش بگەڕێنرێتەوە دادگاکەی خۆی تا لەسەری بڕوات بەو شێوەیەی سەرەوە بەمەرجێك رەسمە تەمیزیەکە بۆ ئەنجامەکەی بەجێ بهێڵرێت. حوکمەکەش بە رێکەوتن لە ١٩/٤/٢٠٠٠ دەرچوو.

**سەرۆك**

**جەلال زێوەر عومەر**

**٢- دەستەی باری کەسی لە دادگای تەمیزی هەرێمی کوردستانی عێراق لە رێکەوتی ٣/ذی الحجة/١٤٢١ك بەرامبەر رۆژی٩/٣/٢٠٠٠ز بە سەرۆکایەتی دادوەری (الاقدم) بەڕێز ( جەلال زێوەر عومەر) و ئەندامیەتی هەردوو دادوەر بەڕێزان ( نازم محەمەد ئەمین جەمیل حەویزیو سەلاح ئەحمەد یەعقوب) پێکهات، کە رێپێدراون بەناوی گەلەوە دادوەری بکەن، ئەم بڕیارەیان دەرکرد:**

**تەمیزکار: داواکار/س**

**تەمیز لەسەر کراو: تەمیزکاری بەرامبەر**

**داوالێکراو/ ش**

پارێزەری بەڕێز (ب) لە بریکاری (س)ی داواکارەوە لەبەرامبەر دادگای باری کەسی لە دهۆك بانگەشەی ئەوەی کرد کە داوالێکراو بە




(نارەوا) بڕیکاردەرەکەی تەلاق داوە بەپێی ئەو حوکمەی لە دادگای ناوبراوەوە دەرچوو لەژێر ژمارەی ١٥/ش/٩٩٩ لە ١٩٩٩/٢/١٥ ئەمەش زیانێکی زۆری پێگەیاند کە بە (٥٨٨٠٠,٠٠٠) دینار مەزەندەی کردووە، بۆیە بانگی داوالێکراوی کرد بۆ دادبینیو حوکم دان بەسەریدا بەوەی بڕی (١٠٠٠,٠٠٠) دینار بدات بە بریکاردەرەکەی، دواتر دەعوایەکی (منضمة) یان سەربەخۆی بۆخۆی هێشتەوە بۆ بڕەپارەکەی تر، خەرجییەکانیشی بکەوێتە ئەستۆ. لە ئەنجامی دادبینیە غیابیەکە، دادگای ناوبراو بڕیاریدا داوای داواکار ڕەت بکرێتەوەو خەرجیەکانیشی بکەوێتە ئەستۆوە لە ئەنجامی ئەو تانە تەمیزیەی لەلایەن داواکارەوە پێشکەش کراوە ئەم دادگایە بە بڕیاری ژمارە ٦١/کەسێتی/٩٩٩ لە ٥/٢ ١٩٩٩ بڕیاریدا حوکمی ناوبراو هەڵبوەشێتەوەو داواکە بگەڕێنرێتەوە دادگاکەی خۆی تا بەو شێوەیە لەسەری بڕوات کەباس کراوە لە بڕیارەکەدا، دوای ئەوەی جارێکی تر دادبینیەکە بەڕێوەچوو، دەعوایەکی (منضمة)ش لەلایەن داواکارەوە ئیقامە کرا بەو بڕە پارەیەی کە لەلایەن پسپۆڕانەوە مەزەندەکرا کە دەکاتە (٥٧٦٠٠) دینار، دادگای بابەت لە ڕێکەوتی ١٩٩٩/٨/٨ حوکمێکی دەرکرد کە قەزاوەت دەکات بەپابەند کردنی داوالێکراو بەوەی پارەی ناوبراو بدات بە داواکار لەگەڵ ئەوەی خەرجییەکانیشی بکەوێتە ئەستۆو دەعواکەش ڕەت بکرێتەوە بە زیادە. داوالێکراو تانەی لە حوکمەکەدا ئەم دادگایەش بڕیاریدا هەڵیبوەشێنێتەوە بەو بڕیارەی کە لەڕێکەوتی ١٩٩٩/٩/٤ دەرچوو لەبەر نەگونجانی لەگەڵ یاساداو، گەڕانەوەی فایلی دەعواکەش بۆ دادگاکەی خۆی تا لەسەری بڕوات بەپێی بڕیاری

هەڵوەشاندنەوەکە. دوای ئەوەی سەرلەنوێ دادبینیەکە بەڕێوەوویەوەو پسپۆڕ هێنراو گفتوگۆیان ئەنجامدا، ڕاپۆرتێکی نوێیان پێشکەش کرد، دادگا حوکمێکی نوێتری دەرکرد کە داوالێکراو پابەند دەکات بەوەی سی‌و حەوت هەزار دینار وەك قەرەبوو لە تەلاقە نارەواکەی بدات بە داواکارو، ڕەتی داوای داواکاریش بکرێتەوە بە زیادەکەی، هەردوولاش خەرجییە ڕێژەییەکەیان بکەوێتە ئەستۆ، لەبەر ئەوەی هەردوولا قەناعەتیان بە حوکمەکە نەهات، بریکاری داواکار تانەی لێدا بەلائیحە تەمیزیەکەی لە ڕێکەوتی ٢٠٠٠/٢/٢٠ هەروەها بریکاری داوالێکراویش بەلائیحەکەی لە ڕێکەوتی ٢٠٠٠/٢/٢١ تانەی لێدا، دوای گەیشتنی فایلەکە خرایە بەر باس و توێژینەوە.

**بڕیار:**

دوا بەدوای وردکاری‌و لێکۆڵینەوە: دەرکەوت کە هەردوو تانە تەمیزیەکە پەیوەستن بە یەك بابەتەوە، بۆیە بڕیاردرا یەکبخرێن و، هەردوو تانەکەش لەماوەی یاساییدا پێشکەش کراون بۆیە بڕیاردرا لە ڕووی شێوازەوە قبوڵ بکرێن، دوا بەدوای تێڕوانینەوە بەحوکمە تەمیزکراوەکەدا دەرکەوت کە ڕاستەوخۆ لەگەڵ حوکمی شەرع و یاسادا دەگونجێت بەشێوەیەك لەسەر بڕیاری تەمیزی ژمارە ٩٩/١٦٩ لە ١٩٩٩/١٢/١٦ دەرچووە، لەبەر ئەوە بڕیاردرا پەسەند بکرێت و تانە تەمیزیەکانیش ڕەت بکرێنەوەو، هەرلایەکیش ڕەسمە تەمیزیەکەی خۆی بکەوێتە ئەستۆ، بڕیارەکە بەڕێکەوتن لە ٢٠٠٠/٣/٩دەرچوو.

سەرۆك

جەلال زێوەر عومەر



# نهر الاسلام


مجلة ثقافية علمية اسلامية
تصدرها وزارة الاوقاف والشؤون الاسلامية
لاقليم كوردستان العراق

# 16

السنة الرابعة

ربيع الاول ١٤٢٣ هـ جۆزەردانی ٢٧٠٢ ی ك

حزيران ٢٠٠٢ م





العنوان
اربيل - ديوان وزارة الاوقاف والشؤون الاسلامية
مديرية الاعلام
☎ ٢٢٣٠٩٤٤
٢٢٢٢٦٩٣


في هذا العدد :








أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ
صَدْرَكَ ۝ وَوَضَعْنَا
عَنكَ وِزْرَكَ ۝ الَّذِي
أَنقَضَ ظَهْرَكَ ۝
وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ ۝
فَإِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا ۝
إِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا ۝
فَإِذَا فَرَغْتَ فَانصَبْ ۝
وَإِلَى رَبِّكَ فَارْغَبْ

**صدق الله العظيم**

**( سورة الشرح )**





# الطبع كوردي وهذا عربي

عبداللطيف باموكي

حين ارتأت وزارة الاوقاف في حكومة اقليم كوردستان اصدار مجلة فكرية اسلامية، تجمع بين الأصالة والحداثة في اطار النهج والفكر الاسلامي، وكانت عارفة معرفة تامة بأن مصادر الثقافة الاسلامية الموجودة هي العربية الفصيحة منذ فجر الاسلام وحتى الوقت الحاضر، وان تضلع علماء الكورد بلغة الضاد لايقل عن مراسهم في اللغة الكوردية الحبيبة، فالكورد وعلماءهم عارفون بالعربية آلة وغاية فهماً وتعبيراً، انشاء وابداعاً نشراً و نثراً نظماً وشعراً، وتراث العلماء الكورد زاخر وخير شاهد في سفر المؤلفين والمفسرين والمحدثين وغيرهم. الاّ ان سوء الأستفادة من ولع الكورد بلغة القرآن ادى الى اهمال الثقافة الاسلامية في ثوبها الكوردي الزاهي الأنيق، وطغيان اللغة الحاكمة المستبدة وطمس معالم اللغة الكوردية واهمالها قلباً وقالباً ومحاربتها درساً وكتابة، لهذا صدرت مجلة (خورى ئيسلام) باللغة الكوردية قطعاً لدابر الاستغلال ونتبرأ لسوء الاستخدام وانعاشاً للغة القومية وجعلها وعاء للفكر الاسلامي وبما ان الكورد وعلماءهم وكتابهم متمسكون بالاسلام ايماناً وبالتآخي القومي احتساباً فقد عزمنا على اصدار قسم من المجلة باللغة العربية بلفظ اعذب وسبك احسن ومفهوم اصح يضاهي العربية في عصورها الذهبية ونأمل ان تكون المقالات المرسلة بعيدة عن التعقيد وان تكون الجمل متقاربة في الجزالة والمتانة والرقة والسلاسة وان لا تكون الالفاظ الشريفة اثواباً للمعاني المبتذله السخيفة ولا تنفصل اللغة عن الدين وتكون العربية والقران كالجسم والروح ولا يشكو الاسلام ابناءه ولا يهمل المضمون على حساب اللفظ وان تكون المقالات تعالج القضايا الساخنة في ارض كوردستان ولا تنبش الماضي المؤلم ولا تجتر المواضيع التي اكل الدهر عليها وشرب ولم تبق في ارض الواقع احداثها واشخاصها وان تكون بعيدة عن الابتذال والتكرار قريبة من العرف السائد ومما عمت البلوى به ويعاني المجتمع الكوردي من غموضه واشكاله.

ونقول براحة البال وبراعة الاستهلال:

بشرى فقد انجز الأقبال ما وعدا– وكوكب المجد في افق العلا صعدا

ونحمدالله ان كوردستان اصبحت مزدهرة بالوان الأزهار والأنوار والأخوان فكأنها باقة من الزهور البرية وطبقة من الفاكهة الناضجة الطرية عليها ماتشتهيه الانفس وتلذ الأعين وتطيب الألسن وترتاح الأنفس ومن الله التوفيق.





# حساب الجُمل

**عثمان رشاد المفتي**

## مقدمة :

هذا علم من علوم الأولين، يكاد ان ينسى في خضم ثورة المعلومات والمعارف وتنوعها وسعتها ووسائلها وسهولتها بين المتلقي للمعرفة ومصدرها.

لذلك فضلت أن ألقي الضوء على هذا العنوان، لأستمرارية هذا العلم. واحتياج من يتابع كتب التراث الأسلامي والأدبي له. وهذا العلم يعرف في اصطلاح اللغويين بحساب الجمل.

## أرقام الحروف

١. لو تصفحت اي منجد في اللغة العربيِة لوجدت في باب حرف (الألف) جدولا، فيه رقم إزاء كل حرف كما يلي:

| الحرف | رقمه | الحرف | رقمه | الحرف | رقمه |
|---|---|---|---|---|---|
| آ | ١ | ك | ٢٠ | ش | ٣٠٠ |
| ب | ٢ | ل | ٣٠ | ت | ٤٠٠ |
| ج | ٣ | م | ٤٠ | ث | ٥٠٠ |
| د | ٤ | ن | ٥٠ | خ | ٦٠٠ |
| هـ | ٥ | س | ٦٠ | ذ | ٧٠٠ |
| و | ٦ | ع | ٧٠ | ض | ٨٠٠ |
| ز | ٧ | ف | ٨٠ | ظ | ٩٠٠ |
| ح | ٨ | ص | ٩٠ | غ | ١٠٠٠ |
| ط | ٩ | ق | ١٠٠ | | |
| ى | ١٠ | ر | ٢٠٠ | | |

٢. هذه الأرقام تسمى حساب الجمل الكبير، وهو الشائع والمتداول.إلا انها تتغير إلى نوع آخر وتسمى حساب للجمل الصغير. وهي الأرقام والحروف ذاتها من (١-١٠) اي من (أ-ي)،والأحرف: (س) و(ش) و(خ) و(ظ) تسمى حروف ساقطة لا ارقام لها.

والأساس في هذا الحساب ان تجري قسمة ارقام الجمل الكبير على الرقم (١٢) والباقي هو رقم الجمل الصغير. وإذا لم يكن هناك باقي فهو حرف ساقط.

